کۆمەڵە چیرۆک

د. نەوال السەعداوی

# مردنی بەڕێز وەزیری پێشوو

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
جیڤارا کەمال

# مردنــی بــەڕێز وەزیـری پێشوو

دەستت بخەرە سەر سەرم دایە ، و بیهێنە بە سەر قژ و گەردنم و سنگم وەك چۆن لە منداڵیمدا ، تەنها تۆم بۆ ماویت ، و تەنها روخساری تۆیە لەنیو جیهاندا من دەیبینم یان دەمەویت ئیستا لەم دوا ساتانەدا بیبینم.

چەندیش حەزم دەکرد دایە کە سەرزەنشتم بکەیت لەبەرئەوەی پێنج ساڵە نەمبینیویت ، بەڵام من تەنها هەر لەتۆ نەبووم ، بەڵکو لە هەموو جیهان بوبووم لە خۆشم ، تەنانەت لە ماڵ و هاوسەر و هاوڕێکانیشم ، تەنانەت یاری گۆلفیش کە حەزم لیی بوو تەنها جاریك نەمکردووە لەو ماوەی پێنج ساڵەدا ، کچە بچکۆلانەکەشم کە چەندم خۆشدەویست نەمدەبینی ، دایە تەنانەت روخساری خۆشم نەدەبینی ، لەسەرقاڵیمدا تەنها بەخێراییەك سەیریکی ئاوینەکەم دەکرد نەك بۆ ئەوەی روخسارم ببینم بەڵکو بۆ ئەوەی بزانم رەنگی بۆینباغەکەم ریککەوتووە لەگەڵ جلەکانم . بەڵکو گەر لە روخساری خۆشم بڕوانم لە ئاوینەکەدا نایبینم ، گەر سەیری روخساری خەڵکیشم بکردایە لە نوسینگە یان لە جامی ئۆتۆمبیلەکەمەوە لە شەقامەکان نەمدەبینین ، گەر قسەشم لەگەڵ بکەن گویم لییان نەدەبوو دەنگیان بەرزیش بوایە ، بەڵکو بەرزترین هۆڕینی ئۆتۆمبیلم نەدەبیست کە راستەوخۆ لە پشتمەوە بوایە چەندینیش ئۆتومبیل دای بەلامدا تا وازم لە ری رۆیشتن هینا بە پی .

دایە من وەك ئەو کەسە وابووم کە نابیستیت و نابینیت و لەم جیهانەدا ناژی . من لە چ جیهانیکدا دەژیام ، ئایا جیهانیکی تر هەیە جگە لە جیهانی خەڵکی کە مرۆظ بتوانیت تیایدا بژی بێئەوەی خوا رۆحی وەرگرتبیتەوە ؟ دایە من دەشمزانی کە خوا رۆحی لی وەرنەگرتومەتەوە بە بەڵگەی ئەوەی پرسە نامەکەمم بەرچاو نەدەکەوت لە لاپەڕەی پرسە نامەکاندا ، و ناشیت پیاویکی لە پلە و

پایەیەکی وای وەك مندا ئاوا بمریت ، بێئەوەی کە پرسە نامەیەکی گەورەی بۆ بلاَوبکریتەوە لە رۆژنامەکاندا و پرسەیەکی گەورەی بۆ ریکبخریت کە گەورە پیاوانی دەولّەت و لە پیشیانەوە سەرۆکی دەولّەت برِوات تیایدا ، و خەلّکی بە ریز بگرین لەگەلّ سەرۆکدا ، تابلۆیەك بوو دایە هەموو جاریك کە لەو جۆرە پرسانەدا دەرِۆیشتم حەزم دەکرد من بومایە لەناو ئەو سنوقەدا . لەبەرئەوەی نایەت بە خەیالّمدا کە تەنها جاریك لەناو ئەو سنوقانەدا بووبم و بەردەوام لە پشتیانەوە لەسەر پیکانی خۆم دەرِۆیشتم کەواتە من دەژیام ، بەلاّم من لەم جیهانەدا نەدەژیام کە ئیوەی تیادا دەژین ، و ئەوەی ئیوەی سەرقالّ کردبوو منی سەرقالّ نەدەکرد ، بەلّکو من بە گرنگترەوە سەرقالّ بووم ، و سەرقالّیم سنوری نەبوو ، زیاتر بوو لە توانای مێشکم و جەستەم ، لە هەندیك کاتدا جەستەم هیلاك دەبوو و لە جولّە دەکەوت ، بەلاّم مێشکم بەردەوام دەبوو لە کارکردن ، لە هەندیك جاری تردا مێشکم هیلاك دەبوو دەوەستا لەبیرکردنەوە بەلاّم جەستەم دەجولاَو و هەر دەهاتوو دەچوو ، و دەچوو بۆ نوسینگەکە ، و ئامادە دەبوو لە کۆبونەوەکاندا ، و سەرۆکایەتی کۆنگرەکانی دەکرد ، و پیشوازی میوانە رەسمیەکان دەکات لە فرۆکەخانەکان ، و ئامادەی ئاهەنگەکان دەبیت ، و لەوانەیە بە ئەرکیك سەردانی دەرەوە بکات . دایە من ئەوکات سەرسام دەبووم کە دەمبینی جەستەم بەو شێوەیە دەجولّیت بەبی بیرکردنەوەی مێشکم ، بەلّکو دەترسام ، بە تایبەت لەو کاتانەی لە کۆبونەوەیەکی گرنگدا دادەنیشتم و پیویست بوو لەسەرم کە بچمە ناخی مەسەلەکانەوە و ئاگاداربم ، و کۆبونەوە گرنگەکان بریتی بوون لەو کۆبونەوانەی کە تیایدا سەروخۆم ئامادە دەبیت ، منیش هەر لەوکاتەی بووبومە فەرمانبەر لە حکومەتدا قینم لە سەروخۆم بوو ، راهاتبووم لەسەر ئەوەی کە ئەم قینەم بشارمەوە و تەنها لە نوسینگەکەم لەگەلّ ئەوانە باسی بکەم کە وەك خۆم سەروخۆیان

هەبوو یان لە ماڵەوە لەگەڵ هاوسەرەکەم وەك چۆن باوکمم دەبینی هەمان شتی دەکرد لەگەڵ دایکم . من بەردەوام بیدەسەلاَت بووم لە دەربرِینی ئەم رایەم تەنانەت لەبەرامبەر فەرمانبەریکی دەوڵەتی ئاسایی و بچوکیشدا وەك سەرۆك بەشیك یا بەرِیوەبەری فەرمانگەیەك ، چ جای کە سەروخۆم و سەرۆك فەرمانبەریك نەبیت ، هەر فەرمانبەریکی دەوڵەت ، بەڵکو بریتی بیت لە سەرۆکی هەموو دەوڵەت .

چی دەڵییت دایە ، بەڵی ئازیزەکەم ، من لەبەردەمیدا دادەنیشتم لەسەر کورسیەکەم بە رۆح و جەستە و مێشکم بەتەواوی دەدایە بە وریاییەوە ، دەترسام پرسیاریکی لە ناکاوم لیبکات وەلاَمەکەی نەزانم ، و گەر زانیشم دەترسام وەلاَمی راست نەبیت ، و گەر وەلاَمی راستیش بیت دەترسام کە وەلاَمی پیویست و داواکراو نەبیت .

تۆ چی دەڵییت ئازیزەکەم ؟ بەڵی دایە ، ئەمەیە ئەلف و بیی سیاسەت کە لە یەکەمین وانەوە فیری دەبین ، زۆرجار وەلاَمی راست وەلاَمی پیویست و داواکراو نیە ، بەڵام وەلاَمی پیویست و داواکراو هەمیشە وەلاَمی راست بوو ، پیاو دەبیت ئاگادار بیت بە مێشك و جەستە و بتوانیت وەلاَمی راستەقینە لە ناراست جیابکاتەوە ، کە ئەوەش ئەرکیکی قورسە دایە ، لە هەموو ئەرکیکی تری ژیان قورسترە ، و پیویست بوو لە کۆبونەوەکاندا بە مێشك و جەستە وریابم و دانیشم ، بە هەردوکیان ، لەسەر کورسیەکەم ، و دەستی چەپم بیجوڵە لە تەنیشتمەوە دەمایەوە ، و دەستی راستیشم بە قەڵەمیکەوە لەسەر کاغەزیك چاوەرِیی هەر هیمایەکە ، لەوانەیە جوڵەیەکی شاراوەی چاویك بیت یا لێویکی خوارەوە بۆ پیشەوە بە هیمنی یا پەنجەیەك یان سەر راوەشاندنیك یا هەر چونەوەیەکی ماسولکەیەکی بچوکی دەوروبەری دەم ، پیویست بوو لەسەرم کە جوڵەی چاوی چەپ لە چاوی راست جیابکەمەوە ، و جوڵەکە لە

کـاتی خۆیـدا ببینـم یـان پـیش ئەوەی بجولّیـت ، و خێـرا لە مێشـکمدا لیکدانـەوەی بۆ بـکەم ، و بەڵکو پیویستە مێشـکم لەمن خێراتـر بیت و پیش من لیکدانـەوەی بۆ ئەنجام بدات ، و پیویستە چاوەکانم خێراتربن لە مێشکم و جوڵەکان پیش رودانیـان ببینـن ، و گویچکەکـانم پیویستە خێراتر دەنگەکە ببیستن پیش رودانی .

چی دەڵییت دایە ، بەڵـی ئـازیزەکەم ، من لەو کۆبونـەوانەدا بەردەوام پشتم بە هەر پێنج هەستەکەم بەستبوو ، و بەڵکو جەستەم و مێشکیشم هەردووکیـان دەبـوونە پـارچەیەك مولـولەو هەسـتەدەمار لەوکـاتەی لەســـەر کورســـیەکەم دادەنیشـــتم ، وەك تۆپەڵیـــك وایەر و تەلـــی هەسـتەوەری رووت لیـك ئـالاَون و ســەر و قۆڵەکـانم و سـنـگ و سکیان پیکهیناوە .

دایە من ئەوکـات لە زۆری ئەو بە ئاگـایی و هەسـتکردنەم هەستم بە تەوژمیکـــی ســـەیر دەکـــرد لە ناوســـکمدا وەك ئەوەی تەزویەکـــی کارەبـایی تیـدابیت ، بە تـایبەت کاتیـك لە تەنیشـتیەوە یـا لە نزیکـی دەوەستام ، و هەستم دەکرد پەنجەکانی دەستی چەپم دەلەرزین لەگەڵ ئەوەی بە دەستی راستم گرتبومن ، و هەردووکیان یان لەسەر ورگم بوون یا لەسەر سنگم ، و قاچەکانم کۆ بـوون ئیتر بە پیوە بومـایە یـا دانیشــتمایە . دایە ئەوە ئەو دیــمەنەیە کاتیــك لەگەڵیــدا دەبــووم ، و هەرگیز جەستەم نەیدەتوانی هیچ شێوەیەکی تر وەرگریت جگە لەو شـیوازە ، کـاتیکیش تیشـکەکان بەر دەم و چـاوم دەکەوتـن یـان چـاوی کامیراکـان دەیـانگرتم دەمویست پەنجەکـانم لیك بـکەمەوە و دوریـان خەمەوە لە ورگم یان سنگم نەمدەتوانی ، دەمبینین قورس بـوون وەك ئەوەی لەکار کەوتبن .

چـــی دەڵییـــت دایە ، بەڵـــی ئـــازیزەکەم ، ئەمە وینەکـــانم بـــوو کە لە رۆژنـامەکانـدا دەمبینـــی و شــەرمم لەخـۆم دەکـرد ، و خەریـك بـوو رۆژنـامەکەم لە خیزانەکەم دەشـاردەوە بە تـایبەت کـچە بچکۆلانەکەم کە لە نـاو چەنـدین وینـەی سـەر رۆژنـامەکە دەیـدۆزیمەوە و پەنـجە

وردەکانی دەخستە سەر دەم و چاوم و بە دایکی دەوت : ( دایە ئەوە بابە نیە . ) دایکیشی بە پۆزیکی خانمانی پیاوە گەورەکانەوە وەلاَمی دەدایەوە و دەیوت : ( ئەوە بابەیە ئازیزەکەم . ببینە چەند لیهاتووە و وەستاوە لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەت ! ) و کاتیك زەنگی دەنگی هاوسەرەکەم دەهاتە گویم لەوکاتانەدا دەمزانی کە ئەوە دەنگی راستەقینەی ئەو نیە ، و لەژیرەوە دەنگە راستەقینەکە بۆ هەتایی دەشاریتەوە ، لەو کاتەوەی بوینەتە هاوسەری یەکتر و تا دەمرین ، و راستیەکانی هەردووکمانی لە ژیرخانیکدا شاردۆتەوە لە ناخیدا ، و هەستم پیدەکرد وەك دومەڵیکی گەورەیە لەژیر دەستمدا کە هەرگیز ناتەقیت .

چی دەڵییت دایە ؟ نەخیر ئازیزم ، من تەنها شەرمم لە چاوەکانی کچە بچکۆلانەکەم دەکرد ، کە بریتی بوون لە دوو چاوی مندالاَنە و توانای بینین و روتکردنەوەی راستیەکانمی هەبوو کە هیچ کەسێک لە جیهاندا نەیدەتوانی هەستی پیبکات تەنانەت خۆشم .

بیرتە دایە هەموو جاریك پیت دەوتم کە منداڵ هەموو شتێکی لێوە دیارە ؟ من ئەوکات بڕوام پی نەدەکردیت ، بەڵام دواتر زانیم کە هەندیك جار ، کاتیك کچە بچکۆلانەکەم تیری چاوی تیدەگرتم و سەرنجی دەدام بە چاوە گەورە جیگیرەکانی ، هەستم دەکرد لە چاوەکانی دەترسم ، و وا هەستم دەکرد کە ئەو تیڕوانینە تیژانە تیڕوانینی منداڵیك نیە ، و بریتی نیە لە سەرنجدانی کچیك بە واتایەکی تر کچیکی سروشتی ، و پیویستە کچی سروشتی و کوڕی سروشتیش تیڕوانین و سەرنجەکانیان هیمن تر و کەمتر و ئاسایی تر بیت ، بە تایبەت لە کاتیکدا کە سەرنجی کەسێکی لەخۆی گەورەتر دەدات لە تەمەن و پلە و پایە و بەرپرس لیی ، چ جای گەر ئەو کەسە باوك بیت ، خوای خیزان و کۆڵەکەکانی ، کە کاردەکات و خەرجی دەدات و مافی خۆیەتی ئەندامانی خیزان

هەموو گەورە و بچوك ریزی لیبگرن و ملکەچی ببن ، بە تایبەتی بچوکەکان ؟

چی دەڵێیت دایە ، بەڵی ، ئەمە ئەو قسانەی تۆیە کە بۆت دەکردم و گویم لیدەگرتیت کاتیك منداڵ بووم ، و لە بیرمدا ماوەتەوە بەردەوام تا ئەو رادەیەی بە هاوسەرەکەم دەڵیم و بۆ کچە بچوکەکەمی دوبارە دەکەمەوە و هەروەها بە هەر فەرمانبەریکی بەردەستم و خوارخۆم دەوت و خۆم بەلاوە گرنگ بوو خۆشحاڵی دەکردم و هەمان هەستم دەبینی لای ئەو فەرمانبەرانەی دەوروبەرم ، و برِوام زیاتر دەبوو بەوەی کە دەموت راستیەکی حاشا هەڵنەگرە لە دیر زەمانەوە و هەرکەس لەمە زیاتر بڵیت هەڵەی کردووە یان کفر .

چی دەڵێیت دایە ؟ بەڵی ئازیزەکەم ، هەموو ژیانم لەو کاتەوەی فەرمانبەر بووم تا بوومە وەزیر ، فەرمانبەریکم نەکەوتۆتە بەرچاو جگە لەمانەی من شتێکی تر بڵیت ، و هەر ئەو هۆکارەش بوو وایکرد کە نەتوانم لەگەڵ ئەو فەرمانبەرە ئافرەتە هەڵبکەم ، نەمدەتوانی بە هیمنی وەك جاران لە سەر کورسیەکەم دانیشم ، بە هەیبەت وەك هەر وەزیریك کاتیك لەنیو فەرمانبەرەکانی وەزارەتەکەی دادەنیشیت ، دایە خۆم پی رانەگیرا و هیندەم زانی هەستامە سەرپی و هاوارمکرد بە تورِەیی کە هەرگیز بەو شێوەیە نەبووم . ئەو هیچی وای نەوت ، بەڵام ئەوەی گۆرِی کە من دەموت ، و نەمزانی دایە چۆن خۆم بۆ رانەگیرا ، و چۆن لە هیمنی و ئارامیم دەچووم و تورەبوونم لیی ئەوە نەبوو کە شتێکی جیاواز لە رای منی وتبوو ، یان فەرمانبەریکی بچوکە و لە یەکیك لە راکانی لەگەڵ وەزیر کۆك نیە ، یا ئافرەتیکە و رای خۆی دەردەبرِیت لەبەرامبەر پیاویکدا ، یان کاتیك لەگەڵم دەدوا پیی دەوتم ( جەنابتان ) لە کاتیکدا فەرمانبەرەکانی تر دەیانوت ( بەرِێز وەزیر ) . بەڵکو لەبەر ئەوە لیی تورِە بووم کاتیك قسەی لەگەڵ دەکردم بەشێوەیەك چاوی دەبرِیە چاوم هەرگیز شتی وام نەبینیبوو ، ئەو تیرِوانینە

جیگیرە گەر لە پیاویکەوە بوایە ئەوپەرِی بی ریزی و قیزەونی دەسەلماند ، چ جای گەر فەرمانبەریك بیت و ئافرەتیش بیت ؟ تورِەبونەکەشم بۆ ئەوە نەبوو کە وایکرد بەڵکو بۆ ئەوە بوو چۆن کردی ، چۆن ویرای بیکات .

چی دەڵییت دایە ، بەڵی ، من دەمویست ئەو ئافرەتە چۆن ئاوای کرد ، و ئەم حەزەم گەیشتە ئەوپەرِی تا تورِەی کردم ، تورِەبوون لە خودی خۆم کە بیدەسەلاَت بووم لەوەی نەمزانی یان نەمتوانی بزانم بۆ وایکرد . و وایکرد کە بۆ رۆژی دواتر فەرمانمدا لە نوسینگەکەم ئامادە بیت ، لیی گەرِام لەبەردەممدا بە پیوە وەستاو من دانیشتبووم ، هەستیکی وامدایە کە هیچ بونیکی نیە لە ژورەکەدا و سەرقاڵی قسەکردن و پیکەنین بووم لەگەڵ ئەو کەسەی بە تەلەفۆن لەگەڵمدا بوو ، ئەوەی سەیر بوو بە وەستاوی بە پیوە مایەوە ، هەستم نەکرد گویی لە دەنگم بیت یان سەیریکم بکات ، بەڵکو سەیری وینەیەکی هەڵواسراوی سەر دیوارەکەی دەکرد .

دوای ئەوەی لە تەلەفۆنەکەم بومەوە وا هەستمکرد کە سەیرم بکات . بەڵام ئەو هەر سەرنجی وینەی سەر دیوارەکەی دەدا وەك ئەوەی من بونم نەبیت لە ژورەکەدا ، ویستم لیکدانەوەیەك بکەم بۆ روخساری پیش ئەوەی سەیرم بکات ، بەڵام ئەو سەری جولاَند و چاوەکانی بە جیگیری برِییە چاوم . راپەرِیم وەك ئەوەی لە ناکاودا هەرچی جلوبەرگمە لەبەرمدا کەوتۆتە خوارەوە ، وهەستم بە شەرم کرد و چاوەکانی کچە بچکۆلانەکەمم هاتەوە یاد ، و دەستبەجی ئەو شەرمە گۆرِا بۆ تورِەیی ، و حەزم کرد شەرمەزاری بکەم وەك چۆن ئەو منی والیکرد ، خۆم بینیەوە پییدا دەتەقمەوە و هاوار دەکەم بەسەریدابە دەنگیکی بەرز کە پیشتر وانەبووم : ( چۆن دەویریت ؟! تۆ کییت ، نازانیت کە هەرکەسێک بیت تۆ تەنها فەرمانبەریکی بچوکیت و من وەزیرم ، و چەندیش

بەرزبیت ، لە كۆتاییدا تۆ ئافرەتیت و لە ناو جیگەدا لەژیر پیاودایت ؟! ) .
چی دەڵییت دایە ، بەڵی ، هەر ئافرەتیك گویی لەم قسانە بیت پیاویك پیی بڵیت لە شەرمان دەمریت ، یان لانی كەم دەبوریتەوە ، چ جای كە ئەو پیاوەی ئەو قسانەی پی بڵیت سەرۆكی بیت لە حكومەتدا ، و بریتی نەبیت لە بەرِیوەبەریك یان سەرۆكی بەشیك بەڵكو خودی وەزیرە ، ئەو كە گویی لەم قسانە بوو لە ژوریكی چۆڵی داخراودا نەبوو ، بەڵكو ژورەی نوسینگەكەم پڕبوو لە چەندین فەرمانبەری پایە بەرز ؟ بەڵی دایە ، هەر ئافرەتیكی تر بوایە لە شوینی ئەو دەبوایە لە شەرمدا بمردایە ، و من دەمویست بیكوژم بە هەر شتێک بیت گەر خودی شەرمیش بیت ، بەڵام دایە ئەوەی سەیر بوو ئەم ئافرەتە هیچ شتێک نەیدەكوشت ، و هیچ شەرمیكی پیوە دیارنەبوو بەڵكو تەنانەت سەریشی دانەخست و چاویشی نەتروكاند ، خۆزگە دایە قەبارەی ئەو رِقەت دەزانی كە هەر پیاویك لە پلە و پایەیەكی وا گرنگ و خاوەن كەسیتیەكی پتەوبیت لەنیو فەرمانبەرەكانی خوارخۆی لە وەزارەتدا ، لەبەرئەوەشی كە بە دریژاییی ژیانم فەرمانبەریكم نەهاتۆتە پیش چاو تواناییتی چاو لە ئاستی سەرۆكەكەی هەڵبینی و ئافرەتیك تواناییتی چاو بەرز بكاتەوە لە ئاست پیاودا ، تەنانەت گەر باوكی یا برای یان بەرِیوەبەرەكەی یا كورِی ، چ جای گەر ئەو پیاوە زیاتر بوو لە باوك و براو بەرِیوەبەری و هەر پیاویكی تر لە چاو خەڵكی و لە هەر ئاستیكدا ؟
منیش هەر كاتیك هەستم بە گەورەیی و پیاویتی و پیزانینی خەڵكی بۆ جیگە و ریگەم كردبیت تورِەیی و هەڵچونم زیادی دەكرد ، ئیتر چۆن ئەو ئافرەتە توانی ئەوە بكات لەگەڵم ؟ لەوانە بوو دایە گەر ئەو ئافرەتە سەریكی داموكاندایە و هەڵویستیكی وەرگرتایە تورِەبوونم بەو شێوەیە نەبوایە بۆی و ئارامتر بومایە ، یاخود

چاویکی بتروکاندایە ، بەڵام دایە ئەو لەبەردەممدا وەستابوو و چاوی برِیبووە چاوم وەك ئەوەی سەرۆکی نەبم و ئەو خوار من نەبیت ، وەك ئەوەی کە مـن وەزیـر نەبـم و ئەویـش فەرمـانبەریکی بچـوك نەبیت ، وەك ئەوەی من پیـاو نەبـم و ئەویـش ئـافرەت نەبیت ، وەك من من نەبـم و ئەویش ئەو نەبیت ، و تورِە بوونم زیـادی دەکـرد هەر کـات هەستم دەکـرد من من نیم و ئەویش ئەو نیە ، و ئەموت ئەو کیـیە تـا وام لیبکـات هەسـت بـکەم مـن مـن نـیم ، یـان زیـاتر تـورِەیـی دایـدەگرتم هەرکاتیـك بیـرم دەکەوتەوە کە مـن ئەوم بەو پییەی پلەو پایە و دەسەلاَت و پیاویتیم هەیە و خۆم دەناسـی ، بەڵام دایە ، ئەوەیە کە شیتی کـردووم ، و مـن بەردەوام هەستم دەکـرد کە مـن مـن نـیم یـان ئەو کەسـە نـیم کە پیشـتر بـووم . لەوانەیە دایە بمبوریت و ئەو هەڵویستەم بەرامبەر ئەو ئـافرەتە بە هەند وەرگریت کە هیندەم قین لـەو ئـافرەتە بوو وایکرد بۆ رۆژی دواتر پلـەی گەرمـی جەستەم بەرزبیتەوە بۆ چل پلـەی سەدی و لـەماڵ نەچوومە دەرەوە و پریاسکەی سـەهۆڵ بەردەوام لەسـەر سـەرم بـوو ، و تـاکەم دانەبەزی تا ئەو کاتەی هەرچی برِیاری وەزاری و دەسـەلاَتم هەیە بەکـارم هینا بۆ لەناو بردنی ئەو ئافرەتە .

چـی دەڵییـت ؟ هەرگیـز دایە ، نەمتوانیـوە لەنـاوی بەرم ، و ئەو ئـافرەتە مـایەوە ، بەڕێـکەوت لە خەڵکـانیکم دەبیسـت دەیـانوت ئەو هیشـتا مـاوە . بەڕێـکەوت ئەوەم نەدەبیسـت بەڵکـو بە دزیـیەوە و بە شێوەیەکی شاراوە گویم بۆ هەواڵی هەڵدەخست .

لە ترسـی ئەوەی نەك کەسـێک بمبینیـت ، و بەردەوام هیـوای ئەوەم دەخواست کە ببیستم لە ئەنجامی رووداویك تیـاچووە یـان هەواڵیکـی ناخۆشـی لەبـارەوە ببیسـتم ، بەڵام دایە هەرگیـز ! ئەم ئـافرەتە لە جیهانـدا مـایەوە ، نەك هەر وەك هەر ئـافرەتیکی تـر بوونـی هەبیت ، بەڵکو جاریك بە رِیـکەوت بینیم وەك خۆی وابوو هیچ گۆرِانیکـی بەسەردا نەهاتبوو ، و تیژی چاوەکانی وەك خۆیی و بـی تروکانـدن .

لەگەڵ ئەوەی دایە ئەو وەك هەر ئـــــافرەتیكی تـــــر وابـــــوو ، و تـورِ ەبـوونم لیـی لەبەر ئەوە نەبـوو كە ئەو فەرمـانبەریكە و ئـاوای كردووە بەرامبەرم ، بەڵكو بەهۆی ئەوە بوو كە بە هیچ دەسـەلاَت و هیچ برِ یاریـك بـۆم لەنـاو نەدەچـوو ، و ئەو مـاوەتەوە ، و مـانی بیزاری دەكردم و تورِ ەی دەكردم ، ئارامی لـی تیكدەدام ، و منیش دەمویسـت بـگەرِ یـمەوە بـۆ ئـارامی و خـودی خـۆم وەك پیشـووم . بەڵام دایە ئەو مایەوە و مانەوەی هەرِ ەشەیەك بوو لە مـانەوەی من .

چـی دەڵییت ؟ بەڵـی دایە ، نەمزانـی چۆن گەیشتمە ئەو حـاڵەتە ، و چـۆن فەرمــانبەریكی بچـووك لە پـلەی پێـنج و شـەش دەتوانیـت هەرِ ەشـە لە پیـاویكی گەورەی وەك مـن بكـات لە پـلەی وەزیریـدا . بەڵام من تورِ ە بووم هیچ كاتیك لە ژیانمدا هینـدە تـورِ ە نەبووم ، ئەو تـــورِ ە بونەشـــم هۆكـــارەكەی ئەوە نەبـــوو كە نەمـــدەتوانی بە هەمـــوو تواناكـــانمەوە لەنـــاوی بەرم ، لەبەر ئەوەش نەبـــوو كە ئەو شتێكی كردووە پیشتر كەس نەیكردبیت ، بەڵكو دایە ئەوەی كە منـی بەوشێوەیە تورِ ە كردبوو ئەوەبوو ئەو كـاریكی كردبوو كە خـودی خـۆم هەرگیـز شـتی وام نەكردبـوو ، مـن لە ژیانمـدا چـاوم بەرز نەكـــردۆتەوە لە ئاســـت ســـەرۆكەكانم لە كـــاردا تەنـــانەت گەر فەرمانبەریكی بچوكیش بوبیت و دەسـەلاَتیكی كەمیشـی بەسـەرمدا بوبیت .

تورِ ەبوونم ئەوكات زیادی دەكرد كە دەمزانـی ئەوەی ئەو كردویتـی مـن نەمتوانیوە ئەنجـامی بـدەم لەگەڵ ئەوەی ئەو ئـافرەت بـووە و مـن پیاو ، وەك هەر ئافرەتیكی تر ؟!

چـی دەڵییت دایە ؟ بەڵـی دایە ، ئەو وەك هەر ئـافرەتیكی تر وابـوو ، وەك تـۆ وابـوو دایە . بەڵـــی وەك تـــۆ ، بەڵام دایە مـــن پیشـــتر و لە ژیانمـدا نەبینیبـوو چـاوت لە ئاست كەسـدا بەرز بكەیـتەوە ، وەك ئەو ئافرەتە لە ئاست مندا بەرزیكردەوە . لەوانەیە دایە گەر تەنـها جاریك

تۆم ببینیایە ئەو کارەت ئەنجام بدایە بمتوانیایە بەرگەی حاڵەتی ئەو فەرمانبەرە بگرم، بەڵکو لەوانەبوو گەر جاریك چاوەکانت لە ئاست باوکمدا بەرز بکردایەتەوە بمتوانیایە منیش چاوەکانمی لە ئاستدا بەرز بکەمەوە ، بەڵکو دەمتوانی چاوم لە ئاست هەر پیاویك لە دەسەلاًَتدا بەرز بکەمەوە لە هەر ئاستیکدا بوایە . بەڵام دایە من هیچ کاتیك تۆم نەبینیوە چاوەکانت بەرز بکردایەتەوە ، و گەر تەنها جاریك ئەو کارەت ئەنجام بدایە منیش دەمتوانی ، لەبەرئەوەی دایە لە هەموو شتێکدا من چاوم لەتۆ دەکرد ، وە لەبەرئەوەی تۆ تەنها نمونەیەك بوی بۆ من لە منداڵیمدا ، لاسایم دەکردیتەوە ، لە هەر جوڵەیەکدا ، فیری قسەکردن بووم لەبەرئەوەی وەك تۆ لێوەکانم دەجولاَند ، فیری رۆیشتن بووم چونکە وەك تۆ پیکانم دەجولاَند . لەتۆوە دایە فیری هەموو شتەکان بووم ، ئیتر بۆچی چاوەکانت لە ئاست باوکمدا بەرز نەکردەوە تا منیش لیتەوە فیر ببم ، لەوانە بوو دایە گەر تەنها جاریك ئەو کارەت ئەنجام بدایە کاتیك منداڵ بووم بمتوانیایە بیشکینم هەر بە هەمان ریگە ، بەڵکو لەوانە بوو بمتوانیایە رووی هەر کەسێک لە هەر ئاستیکدا بوایە بشکینم لەو کاتانەی فەرمانبەر بووم .

چی دەڵییت دایە ؟ هەرگیز ئازیزەکەم من سەرزەنشتت ناکەم ، تەنها ئەوەت لی داوا دەکەم کە دەستت بینی بەسەر سەر و گەردنم و سنگمدا وەك چۆن لە منداڵیمدا وات لیدەکردم ، تۆ تەنها کەسێکیت بتوانم دڵمی بۆ بکەمەوە و نەهامەتیە راستەقینەکانمی بۆ باس بکەم ، و نەهامەتی راستەقینەشم ئەوە نیە کە پلە و پایەی وەزیریم لە دەستداوە ، بەڵکو نەهامەتی ئەوەیە کە چۆن لە دەستمداوە .

لەوانە بوو ئەو نەهامەتیە کاریگەری کەمتر بوایە گەر لە ئەنجامی شتێکی مەترسیدار یان گرنگ یا هۆکاریکی شایستە ئەو پلیەم لە دەستبدایە . بەڵام دایە هۆکارەکە نەك هەر نا شیاو نیە بەڵکو هیش کەسێک نە برِوای پیی هەیە یا بە مێشکیدا دەچیت .

لەوانەیە دایە من نەمزانیبیت کە هۆکارەکە نا شیاوە تا ئەو رۆژەی رۆژنامەکانم کردەوە و ناوەکەی خۆمم نەبینی لەنیو ناوی وەزیرەکاندا لە کابینە نویکەی وەزارەتدا . هەستمکرد کە ناوەکەم کەوتۆتە خوارەوە بۆ سەر جەستەم و بی ناو ماوم ، و لە هەر رۆژیکدا کە دەگەڕِیم بۆ ناوەکەم و دیار نیە هیندەی تر دڵنیا دەبم و هەست دەکەم کە جەستەیەکی بی ناوم .
تەلەفۆنەکەش کە رۆژانە زەنگی لیدەدا بی وەوستان و بەردەوام ناوی منی دەبرد ئەویش بیدەنگ ماوەتەوە وەك ئەوەی ئەویش ناوەکەمی خستبیتە خوارەوە . و دایە ئەوەش هەست کردنیکە بە روخان کە لە هیچ قۆناغیکی ژیانمدا هەستم پی نەکردبوو . چی دەڵییت دایە ؟ بەڵی ئازیزەکەم من تا ئەوکات چیژی ئەو شتەم نەدەزانی تا لە دەستمدا . و دەترسم دایە ژیان هەمان شیوازی لی بکەویتەوە ، و ئیمە هەست بە چیژی نەکەین تا لە دەستی دەدەین .
دایە ئەوەش کارەساتیکە بە دوای یەکدا لەبەرئەوەی کات تیدەپەڕِیت و هەلەکە بۆ هەتایی لەدەست چووە .
لەوانەیە ئەوە حاڵی من بیت کاتیك لە تەنیشت تەلەفۆنە بیدەنگەکەوە دانیشتووم و چاوەڕِوانم ، و دەترسم یەکیك لە ئەندامانی خیزانەکەم بمبینیت بەو شێوەیە دانیشتووم لە نزیك تەلەفۆنەکەوە و چاوەڕِوانم ، و خۆم وا نیشاندەدا کە چاوەڕِوان نیم ، لەگەڵ ئەوەی چاوەڕِوان بووم ، تەلەفۆنەکە لی بدات ، و تەنها جاریك زەنگ لی بدات بە هەر شێوەیەك بیت و دەنگی بیت ، پیاو بیت یا ئافرەت ، نزیك بیت یا دوور ، گەورە بیت یان بچوك ، مرۆظ بیت یا ئاژەڵ ، هەر دەنگیك بیت گەر زەڕِەی گویدریژیش بیت ، و تەنها جاریك تەلەفۆنەکە لی بدات و ناوم بەریت . چی دەڵییت دایە ؟ نەخیر ئازیزەکەم ، نەهامەتیەکە ئەوە نەبوو کە تەلەفۆنەکە لی نادات ، یا کە ئەمویست لیبدات ، بەڵکو نەهامەتی ئەوە بوو کە بەردەوام کە من قینم لە لیدانی بووە هەڵە بووم و حەزم لە لینی بووە ، و ئەو بەو

زەنگە بەردەوامەی چیژیکی دەگەیاند بە جەستەم کە ئەوکات نەمدەزانی لەو کاتانەی هیز نەبوو لە جیهاندا بتوانیت ئەو زەنگەیم لی بکات . دایە ئەو چیژە بەهیزتر بوو لە چیژی سیکس و چیژی خۆشەویستی و خواردن و هەموو شتێک لە دونیادا .
ئەو چیژە وەك ئەوە وابوو چیژیکی دونیایی یان نا مرۆظایەتی نەبیت ، و غەریزەکانی مرۆظ و هەستەکانی نەیانناسیبیت ، و ئەو بریتی بوو لە غەریزەیەك بی هەست و غەریزە ، غەریزەیەکە سەرجەم هەست و غەریزەکانی لەناو بردووە و خۆی وەك زل هیزیك ماوەتەوە توانای لەناو بردنی هەر شتێکی هەیە لە جیهاندا ، ماندویتی و بیزاری و کەرامەت و شکاندن لەناو دەبات و هیز و توانایەکی وا دەدات بە جەستەم لە کاتی نوستنیشمدا چالاك بم ، و مێشکم لە خەونەکانیشدا کار بکات ، و هەرچۆنیك بیت و دوای هەر ماندویتیەك لەسەر پیکانم لە ژیر تیشکی خۆردا لەسەر زەوی فرِۆکەخانە وەستاوم ، بە کراوەیی بۆ پیشوازی لە هەر میوانیکی رەسمی ، و وام لیدەکات ماسولکەکانم پتەو بن لە هەر دانیشتنیکی کۆبونەوە و ئاهەنگەکاندا ، و ئامادە بم رۆژ و شەو بە دوو قاچی وەستاوەوە و دوو دەستی تۆپەڵکراو لەسەر سنگ یا سك . بەڵی دایە ، ئەو چیژە سەرتاپایە توانای لەناوبردنی هەر ماندویتی و بیهیزیەکی هەبوو ، بەڵکو توانای هەبوو خۆی ومنیش لەناوبەریت گەر بیویستایە .
چی دەڵییت دایە ؟ بەڵی ئازیزەکەم . هەموو ئەم چیژانەم لە دەستدا لەپیناو شتێکی بی بەهادا ، و چ شتێک لە ژیاندا بی بەهایە لە پاڵ ئەم چیژەدا ؟ بەڵام راستیەکەی دایە ئەوەبوو کە ئەو شتە بی بەها نەبوو ، و شتیکی ئاسایی و ساکار نەبوو ، و بەڵکو تەواو پیچەوانە بوو . ترسناکترین شتێک بوو کە دەکرا بەسەرم بیت ن و ترسناکترین شتێک بیت کە روبەرووم بوایەتەوە ، وەك مردن دایە ، بەڵکو هەندیك جار هەستم دەکرد دەتوانم روبەرووی مردنیش

ببمەوە . بەڵام نەمزانـی لەو رۆژەدا چیم بەسـەر هات ، لەگەڵ ئەوەی وەك هەمیشـە لەسـەر کورسیەکەی خۆم دانیشـتبووم ، بە مێشـکیك و جەستەیەکی وریاوە ، و هەر پێنج هەستەکەم لە ئاگای تەواودا بـوون ، و جەستەم و مێشکم بوبوونە یەك تۆپەڵ هەستە دەمـاری راداری ، رووت و ئامادە بۆ وەرگرتنـی هەر هیمـا و جوڵەیەك . وەك هەمیشـە لەسـەر کورسیەکەی خـۆم دانیشـتبووم ، و بیگومـان دەمزانـی کە لە جیـی خـۆمم و بـی گـۆرِان ، و لەگەڵ ئەوەی کە زۆر وریـام بەڵام بیئاگام ، و بۆ یەکەمجارە لە ژیانمدا ناتوانم بە وردی گویرِادیرم و مێشـکم کۆنترۆڵکەم ، و مێشـکم وایلیهـاتووە بـی مـن بیردەکـاتەوە ، و بە شتێکەوە خەریـك و سـەرقاڵ دەبیت من نامەویت پیوەی خەریـك ببم ، و ئەمە نەهامەتی و کارەسـاتە گەر بەسـەر هەر فەرمـانبەریکی ئاسـاییدا بیـت لە کۆبونـەوەکانـدا ، چ جـای مـن کە وەزیـریکم و لە کۆبونـەوەیەکـدام دەبـم بە سـەرۆکی وەزارەتیـك ؟ کارەسـاتەکە ئەوە نەبـوو دایە کە کۆنترۆڵکردنی مێشـکم لە دەستداوە ، بەڵکو گەر ئەو لە پیناو شتێکی گرنـگ بیری بکردایەتەوە وەك راپۆرتـی سـالاَنە کە مـن لە دژی دەبـووم یـان میـزانیەی نـوی کە داوام دەکـرد ، لەوانەیە هەستم بە شتێک بکردایە لە حەوانەوە و غەمبـاری ، بەڵام کارەسـات ئەوەبـوو کە مێشـکم بیـری لە شـتێکی گرنـگ نەدەکـردەوە ، بەڵکـو بیـری بـۆ شـتێکی بـی بەهـا رۆیشـتبوو ، بـی نـرخ تـرین شـتێک کە مێشـکی پیـاویکی لە پلە و پایەیەکی وەك منـدا بیـت و بە تـایبەتیش لە کۆبونـەوەیەکی لەم جۆرەدا .

چی دەڵییت دایە ؟ نەخیر ئـازیزەکەم ، مـن بیـرم لە کەس نەدەکـردەوە ، بەڵکـو بیـرم لەخـۆم دەکـردەوە . ئەمویسـت بـزانم چـۆن لەسـەر کورسیەکەم وەك هەمیشە دانیشم کە وەك جاران نیم .

دەمویسـت بـزانم ئایـا ئەوە مـنم دانیشـتووم لەسـەر کورسـیەکەم یـان کەسـێکی تـرە ، و کـام لەو دوو کەسـە مـنم ، کیشـەکەش دایە لەوەدا نەبوو کە نەمدەزانی ، بەڵکو دەمزانی کیشەکە هۆکارەکەی تەنهـا ئەو

فەرمانبەرە بچکۆلانەیە بوو و من نەفرەتم لەو رۆژە دەکرد کە بە دیداری گەیشتم ، چونکە لەو رۆژەوە بیرم هەر لای ئەوە . لەوانەبوو کەمیك هەستم بە حەوانەوە و خەمۆکی بکردایە گەر چوونی بیرم بەلایەوە هۆکارەکەی میینەییەکەی بوایە ، لەکۆتاییدا من پیاوم ، و هەر پیاویکیش لە هەر ئاست و پلەوپایەیەکدا بیت هەندیك جار بیری بەلای ئافرەتدا دەرِوات . بەڵام دایە کیشەکە ئەوە نەبوو لەوکاتەدا کە بیرمی بردبوو وەك ئافرەتیك یان میینەیەك ، چونکە ئەو لەبەرچاومدا هەرگیز میینە نەبوو ، و لەوانەیە ئەو ئافرەتە یەکەمین ئافرەتیك بوبیت کە لە ژیانمدا بینیبیتم و هەستی میینەیی لا دروست نەکردبم . بەڵام ئەو شتەی کە بیری سەرقاڵ کردبووم تا ئاستی لە دەستدانی کۆنترۆڵکردنی ئەوەبوو کە سەرباری ئەوەی ئافرەت بوو ، و لەگەڵ ئەوەی فەرمانبەریکی بچوك بوو ، بچوکترین فەرمانبەریك کە چوبیتە نوسینگەی وەزیر ، توانی شتێکی سەرسورِهینەر و بەدەر لە باو دروست بکات ، و دوور لە هەموو ئەو داب و نەریتیك کە لەو رۆژەوەی ژیانمان ناسیوە و بوینەتە مرۆظ فیری بوین .

نەهامەتیەکەش ئەوە نەبوو دایە کە وایکردبوو ، یان لەبەرئەوە بوبیت کە کەسی تر یان من وام نەکردبوو ، بەڵکو نەهامەتیەکە ئەوە بوو کە لەو ساتەوەی ئەنجامدابوو هەست ناکەم من خۆم بم ، و ئەوەی لەسەر کورسیەکەم دادەنیشیت من نیم ، بەڵکو کەسێکی ترەو خەریکە نایناسم و نەمدەزانی کام لەو دوو کەسە منم ، دایە ئەوە تەنها پرسیاریك بوو کە میشمکی داگیرکردبوو ، لەگەڵ جەستەم و هەر پێنج هەستەکەم لەو کۆبونەوەیەدا ، دایە من هەوڵمدەدا بەرهەڵستی بکەم ، تا لە مێشکمی دەرکەم ، دەستی چەپم دەجوڵاَ وەك ئەوەی بیەویت لە مێشکمی وەدەرنیت و دەستی راستیشم وەك هەمیشە قەڵەمیکی پیبوو لەسەر کاغەزیك ئامادەی هەر جوڵە و هیمایەك بوو وەریگریت ، پیویست بوو دەستی چەپم

وەك هەمیشە لە تەنیشتمەوە یان لە گیرفانمدا بی جوڵە بمینیتەوە ، و هەرکەسێک لەو کاتانە بیبینیمایە دەستم بەو شێوەیە دەجولاَند وا هەستی دەکرد میشیکی چەتوون لە دەم و چاوم دەردەکەم ، لەبەرئەوەی هۆڵی کۆبونەوەکان شوینیکی پاك و خاوین بوو خاوینترین جهۆلیك لە ولاَتدا و دواهەمین هۆڵە لەسەرزەوی کە میشیك بتوانیت بچیتە ناوی ، و جوڵەی دەستی چەپم نائاسایی بوو ، و لەبەر ئەو هۆیەش سەرنجی دەوروبەرم بۆ خۆم راکیشا .
دایە من ئەوەم زۆر پیناخۆش بوو لەو کۆبونەوانەدا ئاورِم بۆ بدریتەوە . و حەزم دەکرد بەبی دەنگی لەسەر کورسیەکەی خۆم بمینمەوە و هەستم پی نەکریت و دووربم لەهەر پرسیاریك لیم بکریت .
چی دەڵییت دایە ؟ نەخیر ئازیزەکەم ، لە پرسیارکردن نەدەترسام ، هەروەك لەوە نەدەترسام کە وەلاَمەکە نەزانم ، لەبەرئەوەی پرسیارە راستەقینەکان ئاسان بوون و زانراوبوون ، ئاسانترین پرسیاربوون ، ئاسانتر لە هەر پرسیاریکی ماتماتیکی کە لە منداڵیمدا هاتۆتە ریگەم کاتیك قوتابی بووم ، وەك ساناترین خشتەی لیکدان ، یەك کۆ یەك یەکسانە بە دوو . دایە ئەوەی قورس بوو و لیی دەترسام وەلاَمە راستەقینەکە نەبوو ، بەڵکو دەترسام وەلاَمە راستەقینەکە بڵیم .
چی دەڵییت ئازیزەکەم ؟ بەڵی دایە ، ئەمە بوو کارەساتی راستەقینە کە ئەو رۆژە تیی کەوتم . تینەگەیشتم چۆن تیی کەوتم ، نەمزانی ئەوە من بووم وتم یان ئەو کەسەی تر کە لەسەر جیگەکەم دانیشتووە . من ئەو کات هیشتا لەسەر کورسیەکەم دانیشتبووم وەك بۆم باسکردیت ، لەوە دەچوو جوڵەی دەستەکەی ترم سەرنجەکانی راکیشابوو بۆلای خۆی ، هەستم کرد چاوەکانی دیت بۆلای منەوە وەك چاوانی باوکم لە منداڵیمدا ، کاتیکیش چاوەکانی دەهاتن بۆلای منەوە ، هەوڵمدەدا کەمیك بچمە دواوە یان بیمە پیشەوە وەك چۆن

کاتیـك قوتـابی بـووم لەپۆلـدا وام دەکـرد ، بەو هیـوایەی چاوەکـان بـکەونە سـەر ئەوەی لە پیشـمەوە یـان لە پشـتمەوەیە و نەکەونە سـەر من . بەڵام من ئەو ڕۆژە لەسەر جیگاکەم نەجولاَم .
لەوانەیە لەو ساتەدا ئاگاداریجوڵەی چاوەکانی نەبووبم لە کاتی هاتنی بـۆلای مـن ، یـان لەو کـاتەدا مێشـکم تەواو نەبـووە ، یـان تـام بەرز بـووە و نەخـۆش بـووم بە هەر هۆکـاریکی تـر بیـت . ئەوەی گرنـگ بوو دایە ئەو ڕۆژە لە شوینی خۆم نەجولاَم و چاوەکانی بە هەموو قورسـاییان کەوتنەسـەرم وەك کەوتنـی مـردن ، و کاتیـك پرسـیاریکی لیکردم لێوەکانم کرانەوە بی ئەوەی ئاگـام لـی بیـت و بـی ویسـتی خـۆم وەك ئەوەی دەم و لێـوی کەسـێکی تربیـت جـگە لە مـن ، کەسـێکی سـەر شـیت کە بەخێرایـی وەلاَم دەداتەوە بـی بیرکـردنەوە و بـی کۆشش ، و لەبەر ئەوەی وەلاَمیکی بی بیرکردنەوە و ماندووبوون بـوو بریتـی بـوو لە وەلاَمیکـی ئاسـان ، ئاسـانترین و سـاناترین وەلاَمەکان .
چـی دەڵییـت ئـازیزەکەم ؟ بەڵـی دایە ، ئەو وەلاَمە وەلاَمە ڕاستەقینەکە نەبوو ، لەبەرئەوەی وەلاَمـی ڕاست بریتـی نەبـوو لە وەلاَمـی داواکـراو ، و دایە ئەوەیە ئەلـف و بیـی سیاسـەت وەك لە سەرەتاوە پیم وتـی ، و یەکەمین وانە کە لە سیاسـەتدا فیـری بـووم ، چـۆن لەبیـرم کـرد دایە نـازانم ، بەڵام لەو سـاتەدا لەبیـرم کـرد ، خەمبـاری و پەژارەییم هیندە زۆربـوو هەستم بەو دڵتەنگیە نەدەکرد کە دایگرتبـووم ، بەڵکـو هەسـتم بە حەوانەوەیەك دەکـرد نزیـك لە شـادمانییەوە . لەبەرئەوەی دایە هەسـتم دەکـرد کە قورسـاییەکی زۆر هەیە لەسـەر سـنگم و سـکم ، قورسـتر لە هەردوو دەسـتە لەکارکەوتوەکەم کە لەسـەر سنگم و سکمن ، و قورستر لە جەستە لەکارکەوتوەکەم لەسـەر کورسیەکەم ، بەڵکو قورستر لە کورسیەکە لەسـەر زەویەکە ، وەك ئەوەی زەوی لەسـەر مـن دانیشـتبیت و مـن لەسەر ئەو نەبم .

چی دەڵێیت دایە ؟ بەڵی ئازیزەکەم ، حەوامەوە چۆن حەوانەوەیەك ، چەند هەست بەو حەوانەوەیە دەکەم لەم دوا ساتانەدا کە ئەم دونیایە جیدەهێڵم بە هەمـوو شـتەکانیەوە ، بەڵام کارەسـات دایە ئەوەیە کە سەرباری ئەم حەوانەوەیە و لەم ساتە کە دونیا جیدەهێڵم هێشتا هەر تەلەفۆنەکە نزیکی سەرم دادەنیم ، و چاوەڕوانم تەنها جاریك لیبدات ، و تەنها جاریك گوییستی زەنگەکەی ببم ، هەر دەنگێك بیت ، لە گویچکەکانمدا و بڵیت : ( بەڕێز وەزیر ) چەند حەز دەکەم دایە تەنها جاریك گویم لی بیت ، تەنها یەك جار پیش ئەوەی بمرم.

# تـــاوانێـکی گـەورە

ئەی هەر کەسێک کە ئەم چیرۆکەم دەخوێننەوە سویندتان بۆ دەخۆم کە زۆر لەوە بیتاوان ترم کە بۆی بچن ، و لەوانەیە لەزۆربەتان بیتاوان تربم. و لە بیتاوانی خۆم دڵنیا بووم دوای ئەوەی مردم ( ئێستا من مردووم و دەتوانم بە ئارەزووی خۆم لە بارەی خۆمەوە بدویم بێئەوەی لیتان بترسم ) . من هیندەی منداڵیکی بچوك پاك بووم . واتای ئەوەش گەر یادەوەریتان بەهیز بیت ئەوەیە کە من هەرگیز بیتاوان و پاك نەبووم ، لانی کەم لە روانگەی ئیوەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ئیستا و ئەوساشی لەگەڵدا بیت خۆم بە منداڵیکی بیگەرد و بیتاوان ئەزانم . هیچ کام لە ئیوە بەبیریدا نایەت لە منداڵیدا مێشکی چی تیابووە . منیش وەك ئیوە بووم کاتیك لەسەر زەوی بووم .

ئیمە منداڵیمان بیر دەچیتەوە کاتیك گەورە دەبین ، و خەونەکانمان لەبیر دەکەین هەر کە لە خەو بە خەبەر هاتین . ئەم بیرچونەوانە وامان لیدەکات کە شەرمەزار بین لە بیری منداڵیمان کاتیك گەورە دەبین ، و ئەوەی لە خەونەکانماندا ئەنجامانداوە شەرمەزارین لیی کاتیك بە ئاگادیین .

بەڵام من وەك ئیوە نەماوم ، و ئەزمونی مردن ئازایەتیەکی نا مرۆظانەی پی بەخشیوم ، و وام لیهاتووە پیویستم بەوە نەماوە جیاکاری بکەم لە نیوان قۆناغەکانی تەمەنم . و لە نیوانی هەر قۆناغیك بۆ یەکیکی تر دیواریکی ئەستورم داناوە . تیرِوانینی ئەو قۆناغە پچرِپچرِانەی تەمەنی ئیوە ، نەمتوانیوە خۆمی لی بدەم تا دوای ئەوەی بەرز بوومەوە بۆ ئاسمان . و سەرمسورِما کاتیك دیمەنی ژیانتانم بینی . بەرِاستی دیمەنیکی سەیرە ، زۆر لە دیمەنی مرۆظیك دەکات سەری لیکرابیتەوە و قاچەکانی قرتابن ، و تەنها سك و سنگی مابیت . هەروەك دیمەنیکی ترسناکیشە ، ئەو

روداوی شـــەمەندەفەرەی بیـــر هینـــامەوە کە لە منداڵیمـــدا بینـــیم ، و هەرگیـــز دیمەنـــی ئەو جەســـتەیەم بیـــر نـــاچیتەوە کە لەژیـــر تـــایە ئاسنینەکانی شەمەندەفەرەکە دەریان هینا سەر و قاچی پیوە نەمابوو .

هەرگیز ئەو دیمەنەم بیرناچیتەوە . بەڵام لە راستیدا بیرم چوبووەوە ، بەڵکو خەریکە دەبیتە تەنها دیمەنیك کە بیرم چوبیتەوە لە ژیانمدا . لە زۆری ناشرینی روداوەکە بە تەواوی لە بیرم کردبوو ، هەروەك لە زۆری ناشرینی هیشتا لە بیرمدا مابوو بیرم نەدەچووەوە . ئەوەیە کە ئەمرِۆ ئیوە توشی بوون . کە لەبیر دەکەن و بە پیچەوانەوە . و هەر ئەوەشە هۆکاری چەتونیتان لەسەر زەوی .

بەهەرحاڵ من چیتر لەو دیمەنە ناترسم ، و ئیستا ئازایەتیەکی سەیر هەیە ، و دەتوانم ماوەی یەك خولەکی تەواو لیی ورد ببمەوە ، بەڵکو ئازایەتی و توانام هیندە زیادی کردووە کە دەتوانم خولەکیکی تەواو لە روخساری باوکم ورد ببمەوە . روخسار و دەم و چاوی باوکم وەك هەر روخسار و دەم و چاویکی باوکانی تر وابوو . و سەرجەم دەم و چاوی باوکەکان لام وەك ئەو دەم و چاوە کارتۆنیانە وان کە رۆژانی جەژن دەمانکرِین ، چاوەکان چاو نین ، بەڵکو دوو کونی گەورەن کاتیك لە ناوەوەی ورد دەبوومەوە هیچ شتێکم تیادا بەدی نەدەکرد . و لوتیش پارچەیەکی بەرزی کارتۆنی ، ئەویش دوو کونی تیادایە ، لەژیر لوتیشدا سمیڵیکی دریژی رەش . ئەو سمیڵە بوو لە منداڵیدا ئیجگار پیی پیدەکەنین ، و هەر یەکیکمان ئەو روخسارەمان لە دەم و چاو دەکرد کە بە تەنها قرشیك کرِیبومان ، و بەدوای یەکتردا رامانـدەکرد و بەو سمیڵە دریژە رەشانە یەکترمان دەترساند .

من واهەستم دەکرد باوکمم خۆشنەدەویست بەهۆی ئەو سمیڵە زبرە ترسناکەوە ، بەڵام ئیستا بۆم دەرکەوت ، کاتیك بۆ یەکەمینجار لە دەم و چاوی ورد بومەوە ، کە من بۆ هەمان ئەو هۆکارەش خۆشم

نەویستوە . هەر کە لە چاوەکانی وردبوومەوە زانیم کە ئەو دایکمی کوشتووە . من کاتێك منداڵ بووم دایکمم خۆشدەویست . بێگومان ئێوەش لەوە ناگەن کە منداڵێك دایکی خۆشویست . لەبەرئەوەی ئێوە هەرگیز منداڵ نەبوون ( بیرچوونەوە وا دەکات ئەوەی رووی‌داوە وەك ئەوە وابێت کە روونەدابێت ) . من هێندەم دایکم خۆشدەویست ناتوانم باسی بکەم ، هەروەك هیچ کاتێك ناتوانم لێکدانەوەی بۆ بکەم . من وا هەستم دەکرد کە پاش ئەوەی بەرز بوومەتەوە بۆ ئاسمان دەتوانم باسی بکەم ، و سەرجەم شتە دونیایەکان کۆتاییان پێهاتووە . بەڵام خۆشەویستیم بۆ دایکم کۆتایی نەهاتووە . شتە ناراستەقینەکان کۆتاییان دێت ، بەڵام شتە راستەقینەکان هەرگیز کۆتاییان نایەت . خۆشەویستیم بۆ دایکم ئەوەندە زۆر بوو تا ئەو رادەیەی وا هەستم دەکرد لێرەیە . ئەوە تەنها بۆچونێك نەبوو ، بەڵکو هەستێکی تا رادەی راستی بوون بوو . جەستەی ئەو و من یەك جەستە بوو . ئەو ماوە کەمەی نێوان من و دایکم تا ئێستا وەك خۆیەتی وەك لەکاتی منداڵیمدا ، چونکە شتە راستەقینەکان بۆ هەموو جێیەك لەگەڵمانن ، بەرز بینەوە یا نزم وەك جەستەمان لەگەڵماندایە ، خۆشەویستیم بۆ دایکم راستەقینە بوو وەك جەستەم . من منداڵێکی بچوك بووم . هەموو شتەکانیش لە رونگەی منداڵێکی بچوکەوە وەك ناراستەقینە دیارە ، سەرجەم شتەکان وەك خەون بوون ، و خەڵکەکان وەك سێبەر و فریشتە بوون ، و شەمەندەفەرەکەش بەسەر هێڵە ئاسنینە سحراویەکەدا دەرِۆیشت ، و زەنگەکەی لە زەنگە سحراویەکانی دەکرد ، و دەریا بێ بن و ئاسمان دوور ، و شەقامەکە بی کۆتایی ، و شەو تاریك و ترسناك تا رادەی مردن .

من لە دوو شت دەترسام : تاریکی و مردن ، لە نیوەی شەودا جێگەکەم جێدەهێشت و خۆم دەخزاندە جێگەکەی دایکمەوە ، و جەستەم دەخستە نێو جەستە گەرمەکەیەوە ، و تا توانیبێتم پێوەی

دەنوسام ، و جەستەم بچوك دەكردەوە ، هوڵمدەدا جەستەم هێندە بچوك بیتەوە بتوانیت بچیتەوە ناو رەحمی دایکم ، وەك تام لی بهتایە وام لیدەهات ، و هەستم دەکرد هیچ کەسێک بە فریام ناگات لەو تاریکاییەدا تەنها خۆشاردنەوە نەبیت لەناو رەحمی بەسۆزی داخراودا ، کی لەو ساتەدا ببینیمایە ، لە کاتیکدا وەك کۆرپە خۆم بچوك کردۆتەوە ، دەیزانی کە ئەو هەستە راستەقینەیە ، و ئەوە حەزیك نەبوو بۆ دورکەوتنەوە لە مردن ، بەڵکو هەولێك بوو بۆ نزیك بوونەوە لە دایکم ، نزیکبوونەوەیەکی وای کە جەستەم هێندە بە جەستەیەوە بنوسیت تا وای لیدیت جەستەمان دەبیت بە یەك پارچە و تیایدا دەتویتەوە ، هێندەم خۆشدەویست ونبوونی جەستەم لە جەستەیدا ون بوون نەبوو ، مردن نەبوو ، ئازاریشی نەبوو ، ترسناکیش نەبوو ، بەڵکو لوتکەی ژیانم بوو ، و ئەوپەرِی حەزم بوو ، و دڵنیایی و متمانەیی و حەوانەوەی تەواو بوو .

لەو ساتەدا من هەستم بە هیچ شتێک نەدەکرد . هەموو ئەوانەی لە دەوروبەرم بوون گەرم بوون وەك مەمکەکانی دایك ، و بیدەنگ وەك بیدەنگی رەحم لە ناوەوە و جیهان بە هەموو دارو درەخت و ئاسمان و خانوو و دەریا و شەمەندەفەر بونی نەماوە ، دەنگەکان نەماون ، و چاو و گوی و لێوەکانم نەماون ، بەڵکو بریتیە لە هەستە خامەکان و تەنها هەست بە گەرمی و بۆنی شیر دەکات .

لەو حاڵەتەدا نەمدەتوانی هەست بە بوونی باوکم بکەم ، کە لە تەنیشت دایکمەوە بە جەستە گەورەکەیەوە راکشابوو ، و سمێڵە رەشە درێژەکەشی لەگەڵ لەرینەوەی لێوی سەرەوەی دەلەرییەوە ، و لێوی خوارەوەی شۆرِ بوەوە لە پرخەپرخدا ، و تاڵێك لیکی سپی لە کۆتایی لێوەکانیەوە لە ناو دەمیەوە هاتبووە خوارەوە ، بەسەر ریشیدا لەگەڵ ئەو خەوەی قوڵەی لیی کەوتبوو ، ئەوکات وا هەستم کرد کە هەرگیز خەبەری نابیتەوە ، چاوەکانی کردەوە ، لەگەڵ ئەوەی کە من نەمدەبینی ( بەهۆی خۆ

بچوککردنەوەم ) بەڵام هەستم بەو تیرِوانینە خێرایەی ئەو کرد ، کە هەر بە خێرایی ونبوو . ئەوکات نەمزانی کە ئایا خۆویستانە ونبوو یان ئەو ونیکرد . بەڵام ئیستا تیگەیشتم کە ئەو خۆی ونیکردووە لەگەڵ ئەو تاریکاییەی ژوورەکەی تەنیبوو ، لەگەڵ ئەوەی کە من نەمدەتوانی چاوەکانمی لە ئاستدا هەڵبینم ، ئەو تیرِوانینە بەس بوو بۆئەوەی مێشکم وەك تیریك کون بکات ، لەگەڵ ئازاری ئەو کونکردنە ، و سەرباری ترسم لیی و تاریکایی کوشندە ، لەگەڵ ئەوەی بە خێرایی ونیکرد ، و تیرِوانینی خۆشەویستی باوکایەتی بۆ گەرِایەوە ، بەدەر لە هەموو شتێک توانیم لیکدانەوە بۆ ئەو تیرِوانینە بکەم کە بریتی بوو لە تیرِوانینی مرۆظ کاتیك دەیەویت قینی خۆی دەربرِیت .

باوکم پیاویکی مۆدیرن بوو ، وەك هەر پیاویکی تری ئەم سەردەمە نوییەمان ، وەك ئەوانەی توانای شاردنەوەی هەستە راستەقینەکانیان هەیە ، و دەرخستنی شیوازیکی تر لە جیاتی ، وەك هەموو ئەوانە باوکم توانی حەزی ئەوەی دەست بخاتە بینم بشاریتەوە ، و بۆ دوور فرِیمدات ، و بەرِاستی دەستی بەرەولای من جولاَ ، بەڵام گیرِایەوە . لە پاشان ئەو جوڵەیە گۆرِا بۆ جوڵەی بەسۆزی باوکایەتی کە چۆن دەدات بەسەر شانی کورِیکیدا ، و بە جوڵەیەکی ئاسان توانی جەستەی نیوان من و دایکم لیك بکاتەوە ، و کەوتمە سەر لێواری ساردی سەر جیگەکە و شوینە گەرمەکەی داگیرکردم .

وەرز زستان بوو ، و شەو سارد بوو ، و بەتانیەکە بە ئاستەم دەگەیشتە لێواری جیگاکە و نیوەم پیوە بوو و پشتم بە تەواوی بەدەرەوە بوو . باوکم جولاَو هەموو بەتانیەکەی بۆخۆی راکیشاو من بە تەواوی دەرکەوتم . لە سەرمان هەڵدەلەرزیم دایکم چاوەکانی کردەوە . لە راستیدا من هیشتا هەڵنەلەرزیبووم ، بەڵام ئەو تەنها کەمیك چاوەکانی هەڵهینا کە لەوانەبوو بۆ ئەوە بوبیت تا بزانیت

بەتانیەکەم لەسەر لاچووە یان نا ، یان ماسولکەیەکی بچوکی جەستەم خەریکە دەچیتەوە یەك بەهۆی سەرماوە و هەستی پیکردووە پیشوەخت ، و هەر بۆیە لە شیرینی خەودا چاوەکانی دەکاتەوە ، بەڵکو پیش ئەوەی چاوەکانی بکاتەوە ، و بە تەواوی هەستیت ، قۆڵەکانی دریژ دەکات تا دامپۆشیت .
سەرمسورِدەما ، لەخۆم دەپرسی سەبارەت بەو نهینیە ، نهینی ئەو هەستە رادارییەی جەستەی لە کاتی نوستندا و هەستکردنی بە جەستەی من ، لەگەڵ ئەو ماوە زۆرەی نیوانمان ، کە جەستەی باوکم جیای کردبوەوە . سەرسورِمانم زیادی دەکرد کە گویم لی دەبوو باوکم بە خەو قورسی تۆمەتباری دەکرد ، جاریکیان گویم لی بوو دەمەقاڵیی بوو لەگەڵی لەسەر ئەوەی زۆریك لە زەنگی دەرگاکەیداوە و لەبەر خەو قورسی درەنگ لیی کردۆتەوە .
هەروەها باوکم بەوە تاوانباری دەکرد کە گویی کزە . و جاریکیان لییدا ( من لە باوەشیدا بووم نانی دەدامی ) لەبەرئەوەی بانگیکرد تا خواردنی بۆ بەریت گویی لیی نەبوو . جاریکی تریشیان گویم لیی بوو پیی دەوت کە دڵت ساردە و هەست بە هیچ شتێک ناکەیت .
ئەو رۆژە دایکمم بینی بە تەنها لە چیشتخانەکە دەگریا ، لیی نزیك بوومەوە ، و بە گوییدا چەند وشەیەکی تیکشکاوم چرپاند ئەوکات فیری قسەکردن نەبوبووم پیموت : ( تۆ لە باوکم زیاتر هەست دەکەیت دایە ) . چاوەکانی گەشانەوە و سەیری دەکردم وەك ئەوەی سەریسورِمابیت ، وەك ئەوەی سەریسورِمابیت لەوەی کە چۆن منداڵیکی وەك من توانیویەتی هەست بەو راستیە گەورەیە بکات ، باوەشی پیدا کردم و بە چرپە وتی : ئازیزەکەم .
باوکم لەبەر دەرگای چیشتخانەکە وەستابوو ، بینیمی لە باوەشیدا ، چاوەکانی کرانەوە ئەو کرانەوەیەی توانای شاردنەوەیەکی خێرای هەیە . و توانای برِینی ئیسکەکانی سەرمی هەیە ، و وام لیدەکات

بشلەژیم ، وەك ئەو پەشۆكانەی مرۆظ دەیبینیت كاتیك رووبەروو دەوەستیت لەبەرامبەر مردندا .
ئەو گەر ئەو كارەی بكردایە كە مرۆظی ئاسایی دەیكرد لە كاتی قین لیبوندا ، یان گەر پەنجە گەورەكانی بخستایەتە بینم دەحەوامەوە ، هەستم كرد كە بە شێوەیەكی ئاسایی هەڵسوكەوت دەكات ، هەڵسوكەوتی ئاساییش چەند توند بیت بیزارت ناكات ، و متمانەیت پی دەبەخشیت ، بەڵام هەرگیز لە باوكم دڵنیا نەبووم . لیی دەترسام ، و لە هەر جوڵەیەكی دەترسام ، جوڵە بەسۆز و هیمنەكان زیاتر دەیانترساندم وەك لە جوڵە كتوپڕی و توندەكان ، كاتیك لێوەی نزیك دەبووم و جوڵەی دەستیم دەبینی . لەوانەیە هیچ نەكات جگە لە دەستدان بە شانمدا . یان دەستی دەجوڵینیت تا میشیك لە دەم و چاوی دوربخاتەوە ، یان گویی بخورینیت ، بەڵام من دەپەشۆكام . و جەستەم میرولەیەكی هیمنی شاراوەی دەكرد .
نەمدەزانی بۆچی ناتوانم لە نزیك باوكم دانیشم گەر ماوەیەك لە نیوانماندا نەبیت ، بوونی ئەو ماوەیە بەردەوام پیویست بوو ، و بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی ئەوەندە لە باوكم نزیك ببمەوە كە پیوەی بنوسیم. بە پیچەوانەی دایكمەوە ، هەركاتیك لە نزیكم دادەنیشت پیوەی دەنوسام ، پیوە نوسانیكی ئاسایی نا بەڵكو نزیكبونەوەیەكی وا كە حەزیكی تەواو بوو بۆ ئەوەی جەستەمان ببیتە یەك پارچە .
هیچ كەسێكیش بەو حەزەی نەدەزانی جگە لە خۆم . دەیشاردەوە وەك چۆن هەستە راستەقینەكانم دەشاردەوە ، كاتیكیش لە قوتابخانە لە پۆلدا دادەنیشتم ، و مامۆستا داوای لیدەكردم لە دوایەوە بڵیم : باوكمم خۆشدەویت وەك دایكم ، بی ئەوەی نكوڵی بكەم دەموتەوە : باوكمم خۆشدەویت وەك دایكم . كاتیكیش فیری نوسین بووم مامۆستا داوای لیكردم ناوی خۆم بنوسم ، نوسیم : سەمیر ، پیی وتم ناوەكەت بە تەواوی بنوسە ، نوسیم : سەمیر عەزیزە ، مامۆستا بە تورِەییەكەوە سەیریكی دەفتەرەكەی كردم و بە قەڵەمە سورەكەی

ناوی عەزیزەی کوژاندەوە و پیی وتم : ناوی باوکت بنوسە . سەرمسوڕما ، دەمم کردەوە تا نکوڵی بکەم بەڵام مامۆستا گەورە بوو ، منیش بچوك ، بی ئەوەی نکوڵی بکەم نوسیم : سەمیر ئادەم . بۆ رۆژی دواتر مامۆستا داوای لەسەرجەم پۆلەکە کرد لە دوایەوە بڵێنەوە : باوکمم خۆشدەویت وەك دایکم و لەگەڵیان منیش وتمەوە : باوکمم خۆشدەویت وەك دایکم . مامۆستا داوای لیکردین لە دەفتەرەکەماندا پێنج جار بینوسینەوە . بۆ رۆژی دواتر جاریکی تر نوسیمانەوە ، و چەند جاریك لە دوایەوە وتمانەوە ، و پیویست بوو لە ماڵەوە پێنج جار بینوسینەوە ، و بۆ خۆمان دە جار بیڵیینەوە ، پاشان بیست جار ، تا وام لیهات بەدەم خەوەوە دەموتەوە باوکمم وەك دایکم خۆشدەویت ... باوکمم وەك دایکم خۆشدەویت ...
جاریکیان کاتیك دەموتەوە باوکم گویی لیم بوو ، پیکەنی . پیکەنینەکەی سەیر بوو بەلامەوە . شیوازی دەم و چاوی بۆ پیکەنین نەدەشیا . نیوچاوانی بەرز بوو دابووی بەیەکدا لەکاتی نوستنیشدا خاو نەدەبووەوە . ئیسکەکانی دەم و چاوی پتەو بوون و دوو شەویلگەی گەورە وەك شەویلگەی وشتر یان ئەسپ ، و لە جۆری ئەو شەویلگانە نەیدەتوانی پیکەنین دروست بکات . شڵەژام ، هەر جاریك شتێکی نائاسایم بەدی بکردایە ئەو شڵەژانە دەیگرتم . من پیشتر پیکەنینی وشتر و ئەسپم نەبینیبوو . بۆچی وشتر و ئەسپ ناتوانن پیبکەنن ؟ ئەم پرسیارەم ئاراستەی مامۆستا کرد لە قوتابخانە لە وەلاَمدا وتی : سەمیر تەنها مرۆظ دەتوانیت پیبکەنیت .
باوکم نەیدەزانی چیم بەبیردا دیت . من زۆر بە ئاسانی دەمتوانی هەستە راستەقینەکانم بشارمەوە . و کاتیك ئەرکەکانی ماڵەوەم جیبەجی دەکرد بە دەنگی بەرز دەمخویندەوە : باوکم وەك دایکم خۆشدەویت ... باوکمم وەك دایکم خۆشدەویت ... دەمزانی کە درۆ دەکەم و لەبەرئەوەی درۆم دەکرد دەترسام باوکم ئەو درۆیە ئاشکرا بکات ، بۆ ئەوەی فیڵ لە باوکم بکەم زیاتر و زیاتر دەنگم

هەڵـدەبرِ‌ی ، و بە دەنگیکــی بەرز دەمــوت : بــاوکمم وەك دایكــم خۆشدەویت ... ، و چەند دەنگم بەرز بوایەتەوە هیندە ترسم زیادی دەكرد لەوەی درۆ و نواندن تیایدا زیاد بكات ، و زیاتر و زیاتر دەنگــم هەڵــدەبرِ‌ی تــا درۆم بشــارمەوە ، چەنــدیش دەنگــم بەرزبوایەتەوە ئەوەندە درۆ زیادی دەكرد و ترسیشم زیادی دەكرد ، تا وام لیدەهات هاوارم دەكرد وەك فریاكەوتنیك و دەگریام : باوكمم وەك دایكم خۆشدەویت ! ... باوكمم وەك دایكم خۆشدەویت ! ...

هەرگیــز بــاوكمم راســتیەكەی بــۆ ئاشــكرا نەبــوو . كــاتیكیش فرمیسكەكانی بینی بەسەر رومەتەكانمدا دەهاتنە خوارەوە لیم نزیك بوەوە ، بەڵام من وەك هەمیشە هەنگاویك كشامە دواوە ، زیاتر لیم نزیـك بــوەوە ، كشــامە دواوە ، بــۆ دواوە . دەســتی بەرز كــردەوە وامزانی دەكیشیت بەسەر شانمدا ، بەڵام هات بە خەیاڵمدا كە زللەیە و دەكیشیت بە دەم و چاومدا ، راپەرِ‌یم و چوومە دواوە . باوكم هەڵویستەیەكی كرد ، چاوەكانی لە سەرسورِ‌ماندا بوون ، وەك ئەوەی لەو هۆكارە بپرسن . ئەو پرسیارە ئاساییە نا كاتیك مرۆظ هۆكارەكان نازانیت ، بەڵكو ئەو پرسیارە نا ئاساییەی تیایدا هۆكار نەزانراو نابیت ، بەڵكو زانراو دەبیت ، نەك هەر زانراو دەبیت ، بەڵكو بە هەست و مێشک دركی پی دەكریت .

لەو ساتانەشــدا مــرۆظ هەڵــدەچیت و تــورِ‌ە دەبیــت . لەبەرئەوەی سروشــتی مــرۆظ وایە كە هەســت بەوجــۆرە هەســتانە نەكــات كە هەڵقولاَ‌وی راستین ، سروشتی مرۆظ بەردەوام بەلای گوماندایە ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێكی وا نیە كە نەزانراو و هەست پی نەكراو بیت لە ژیانیدا هیندەی گومان . ئەمەیە هۆكاری چەتونی و سەر شیتیتان لەسەر زەوی ، ئیوە راستی و گومانتان لە یەك كاتدا دەویت .

بەڵام مـن ئەوكـات منـداڵیكی بچـوك بـووم ، لە توانامـدا نەبـوو ئەو گومـانەی بـرِ‌ەویـنمەوە . مـن ئەوەی لە توانامـدا بـوو كـردم تـا بە

دەنگیکــی بەرز ئەرکەکــانی قوتابخــانەم بەجــی بگەیەنــم ، ئەوەی لە توانامـدا بـوو کـردم تـا دەنگـم وا لــی بـکەم وەك دەنگــی راسـتەقینەم وابیت .

هەرواش بوو دەنگم لە راستەقینەی دەکرد ، نەمدەتوانی لەوە زیـاتر بـــکەم. بەڵام بـــاوکم هەر لە بەردەممـــدا وەســـتابوو . نەمـــدەبینی لەبەرئەوەی سـەرم داموکانـدبوو و چـاوم لەسـەر زەویەکە بـوو ، و هەرگیز نەمدەتوانی سەرم بەرزکەمەوە و سەیری چاوەکانی بکەم . دەمزانی ئەوکاتەی چاوەکانم لە چاوی گیر دەبیت هەست بە راستیە ترسناکەکە دەکات . راستەقینەی ترسناکیش بریتیە لە بوونـی گومـان بۆ راستی و بوون ، یان بوونـی راستی بە گومـان . بەڵام من لەگەڵ ئەوەی سەرم داموکاندبوو هەستم بەو تیرِوانینە کرد مێشکم کـون دەکات و دەیبرِیت ، گویم نەدایەو پاڵمدا بە دیوارەکەوە .

بەم شـێوەیە بە وەسـتاوی لەبەردەمیـدا مـامەوە بێـئەوەی بتـوانم چیتـر بکشیمە دواوە . و تەنها یەك هەنگاو نیوانمان بوو . و دەمزانی تەنهـا بە چاو تروکاندنیك ماوەی نیوانمان نامینیت ، و ئیتر من و دیـوارەکە دەبینە یەك پارچە ، و بە هەموو توانام پەستانم خستە سـەر دیـوارەکە ، بەڵام دیوارەکە وەك بەرد رەق بوو .

لەو سـاتەدا دایکـم دەرکەوت ، وەك ئەوەی لەپـڕ زەوی قڵیشــابیت . نەمزانــی چـۆن دەرکەوت ، لەکویـوە ، لەبەرئەوەی لەو رۆژەدا ئەو لە مـاڵەوە نەبـوو ، و برِیـاربوو شـەو لای پـورم بەسـەر بەریـت . نەمزانی کاتیك بینیم چیم لـی بەسـەرهات . جەستەم بـی ئاگایـانە و بە تونـدی بەرەولای کشـا . بەخێرایـی هەڵهـاتن لە مـردن و پەنـا بـردنە بەر ژیـان . لەو کـاتەی جەسـتەم بەر جەسـتەی کەوت هەڵسـوکەوتی ئاسایی بوەوە و هیندە توند خۆم پیوە لکانـدبوو مـن و جەسـتەی بـوینە یەك پارچە .

کاتیـك ئەو رۆژەم دیـتەوە یـاد بەخـۆم دەڵـیم : بریـا ئەوەی رویـدا وا نەبوایەو ئەو رۆژە پشتم هەر بە دیوارەکەوە بوایە ، یان خۆزگە من

و دیوارەکە ببوینایەتە یەك پارچە . بەڵام من نەمدەزانی چی رویدەدا . ئەوە کارەساتە مرۆظ نەزانیت چی روودەدات ( ناڵیم بەیانی ) بەڵکو لە ساتوەختی داهاتوودا . ئەو پی نەزانینە وەك نابینایی وایە بەڵکو نابینابوونە و من دەتانبینم لە بەردەممدا دەرِ ۆن بەبی چاو . چاوەکانتان چاوان نین . تەنها کونن هەوای لێوە دەردەچیت ، وەك کونی دەم و چاوە کارتۆنیەکان کە رۆژانی جەژن دەمکرِ ین .

هیشتا ئەو رۆژەم لە یادە . هەرگیز بیرم ناچیتەوە ، وەك دیمەنی ئەو لاشەیەی بی سەر و بی دەست و قاچ بینیم . مێشکم هەموو ئەو شتانەی ئەو رۆژە روویدا عەمباری کردبوو ، لەگەڵ ئەوەی زۆر دوورکەوتۆتەوە ، لەگەڵ ئەوەی سالاَنیکی دورودریژ تیپەرِ یوە ، ناتوانم بیبژیرم ، چونکە لە ژمارەکان تەنها تا 10 فیر ببووم ، بە ژمارەی پەنجەکانی دەست . ئەو سەردەمە مامۆستا لە قوتابخانە تەنها فیری ئەوەندەی کردبووین ، بەڵام من سەرباری تیپەرِ بوونی سالاَنیکی زۆر هیشتا هەر بیرمە ، تەنانەت جوڵە ئاساییەکانیشم بیرە . و هیچکام لە جوڵەکانی باوکم ئاسایی نەبوو هەرچەند ئاسایی ببینرایە ، توانیم ئەو جوڵە شاراوە خێرایەی چاوەکانی بگرم ، بینیم رەشایی چاوەکانی لەسەر دایکم جیگیربوو . من هیشتا لە باوەشیابووم سەرم نوقم کرد لە سنگیدا ، وروخساری باوکم لێوە دیارنەبوو ، بەڵام هەستم بە قۆڵەکانی دایکم دەکرد کە تیمەوە ئالاَون ، و بە هەموو توانای پەستانم دەخاتەسەر ، و بە جەستەی دەمشاریتەوە ، وەك ئەوەی بیەویت لە سنگیدا یا لە جەستەیدا یاخود لە رەحمیدا بمشاریتەوە .

تا ئیرە چیتر باوکم نەیتوانی بە روخساری ناراستەقینەی بمینیتەوە و بەردەوام بیت ، و بە جوڵەیەکی خێرای دەستی لایدا ، و روخساری باوکمم بە شەویلگە فراوانە گەورەکانی و دەموچاوە پڵنگ ئاساکەیم بینی . بۆ یەکەمینجاربوو روخساری باوکمم بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی لێوە دیاربیت . و چیتر وەك پیشتر نەدەترسام . نەمزانی

چۆن ئەو ئـازایەتیەم بۆ گەڕایەوە ، لە پیشـدا و بـۆ یەکەمینجـار بە هیواشـی پیمـوت : خۆشـم ناوییـت ، کـاتیکیش لەبەردەممـدا بـۆ چەنـد ساتیك تیڕاما ، ئـازایەتیم زیـادی کـرد و بە دەنـگیکـی بەرزتـر وتـم : خۆشم ناوییت . کاتیك گویم لە دەنگم بوو دەهاتەوە گویچکەکانم بەبـی خەوش دڵنیابووم کە دەنگی منە ، زیاتر برِوام بەخۆم زیـادی کـرد و پیم وت : خۆشم ناوییت . بەوشێوەیە بەردەوام بووم ، تـا وامليهـات بینـیم بە دەنگیکـی وەك هـاوارکردن هـاوار دەکەم و دەڵـیم : خۆشـم ناوییت ....

وەك پڵنگیکـی درِنـدە هەڵیکوتـایە سـەرم ، بەڵام دایکم لەو بە دەسـت وبـرد تـر بـوو . و لە چاوتروکاندنیکدا دایکم بە جەستە گەورەکەیەوە کەوتە نیوانمـــان . دەموچـــاویم نەدەبینـــی لەبەرئەوەی لە پشـــتیەوە وەستابووم ، بەڵام بە چوونەوە یەکـی ماسولکەکانی پشـتی و هـاتن و چونیـان زانـیم وەك پڵنگیـك لە حـاڵەتی ئامـادەبوونە بـۆ پەلامـاردان . نەمزانــی بەتەواوی چــی روویــدا . و دەنــگە مرۆظانەکــان کۆتــایی پیهـــات . و هەمـــوو شـــتێک لە یەك دوو چـــرکەدا گـــۆڕانـــی بەسـەرداهات . چرکەش وەك خۆی نەمابوو و زەمەن گۆرِابـوو ، و هیچ شتێکی دەوروپشتم نەدەناسیەوە ، تەنـانەت نەمدەتوانی خـودی خۆم جیابکەمەوە کە ئایا زیندووم یـان مـردوو ، هـات بە خەیاڵمـدا کە دەمـرم و هەڵدەسـتمەوە و دەمـرمەوە ، دەیـان جـار ، سـەدان جـار ، هەزاران جـار ، بەوشـێوەیە بـۆ ناکۆتـایی دەمـرم و هەڵدەسـامەوە ، وەك ئەوەی جەسـتەم کەوتبیـتە قـولاَیـی گیژاویـك بە خێراییەکـی سەیر دەخولیتەوە خێراتر لە سورِانی زەوی بەدەوری خۆیدا .

وەلـی سـورِانـی زەوی لەژیـر پیکـانم بـۆ سـاتیك وەستا ، و لەگەڵیـدا زەمەنـیش وەسـتا ، و هەمـوو شـتێک وەسـتا و بەسـتی ، چاوەکـانم کردەوە ، جەستەی دایکمم بینـی لەسـەر زەوی . وامدەزانی نوستووە وەك چۆن لە هاوینانـدا لەسـەر زەویەکە دەنوسـت ، بەهیواشـی لیـی نزیـك بـوومەوە و چرپـانم بە گوییـدا : ( دایە ) . بەڵام وەلاَمـی

نەدامەوە . سەرمسورِمما ... ئەو بە هیواشترین و کەمترین دەنگ بە ئاگا دەهات ، بەڵکو پیش هاتنی دەنگەکە وریا دەبوەوە ، پیش ئەوەی لێوەکانم بکەمەوە بۆ وتنی وشەکە خەبەری دەبوەوە ، پیش ئەوەی چاوەکانی بکاتەوە هەستم بە جوڵەی جەستەی دەکرد ، و پیش ئەوەی من گویم لە دەنگی خۆم بیت ئەو گویی لی دەبوو.

لەگەڵ ئەوەی زانیم کە گویی لیم نیە بە هەرحاڵ ، بەڵام بەردەوام بووم لە چرپاندنی وشەکە بە گویچکەیدا . کاتیك باوکم لەگەڵ مامم و خاڵم هاتن و هەڵیانگرت و بۆ دوور لە من بردیان ، و ماڵەکەی چۆڵکرد سەرمسورِمما . نەك ئەو سەرسورِمانە ئاساییەی گەورەکان دادەگریت ، بەڵکو سەرسورِمانی منداڵان ، ئەو سەرسورِمانە سەیرە ، کاتیك سەرجەم شتەکانی لا دەبیت بە نا راستەقینە ، و ئەوەی روویدا وەك ئەوەیە رووی نەدابیت ، و خەون وەك راستەقینە ، و راستەقینە وەك خەون .

باوکم گواستیەوە خانویەکی تر و منیشی لەگەڵ خۆی برد . رۆژگار و ساڵان تیپەڕی ، گەورەبووم و پیربووم و مردم . لەگەڵ ئەوەشدا و تا ئیستا دیت بە خەیاڵمدا کە ئەوەی روویدا رووی نەداوە .

تەنها بریتیە لە ئیستا ، دوای ئەوەی کە بەرزبوومەوە لەسەر زەوی ، و توانیم زەوی بی خەوش ببینم ، و ئیوەش بی خەوش ببینم ، ئیستا زانیم کە تاوانیکی گەورە بە شاراوەیی و لە نهینیدا ئەنجامدرا کەس پیی نەزانی . یەکەمین تاوان لە ژیانی مرۆظایەتیدا کوشتنی هابیل نەبوو لەلایەن قابیلەوە ، بەڵام ئادەم دایکمی کوشت . کوشتی لەبەرئەوەی خۆشمدەویست و ئەو نا . خۆزگەش بمتوانیایە گەر خۆشی بویستمایە منیش خۆشم بویستایە ، بەڵام باوکم خۆشەویستی نەدەزانی . سەرباری ئەوەی کە منداڵ بووم دەمزانی خۆشی ناویم ، هەروەها دایکیشمی خۆشنەدەویست ، بەڵکو تەنها خواردن و تیربوونی خۆشدەویست .

# نـامەیـەکی خـۆشـەویستی مـۆدیـرن

هــاوڕێم ئەم نــامەیەت بــۆ ئەوە بــۆ دەنوســم وەك هەوڵێــك تــا تیمبگەیت و لیت بگەم ، یان لەخۆم تیبگەم . لەوانەشـە ئەنجامەکەی هیچ نەبیت . کـی دەتوانیت لەخۆی بگـات ، یـا لە بەرامبەرەکەی ؟ کـی دەتوانیت هیلکە شـەیتانۆچکەکە بشکینیت ؟ هەوڵدان بۆ شکاندن تەنها بۆ دڵنیا بوونە لە نەشکاندن ، و هەوڵـی تیگەیشتن تەنـها زیـاتر نوقم بوونە لە تینەگەیشتندا لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا من هەوڵدەدەم . باشیش دەزانم کە هەوڵەکەم تەنها خۆ خەریك کردنیکە و هیچی تر ، بەڵام ناوەستم لە هەوڵدان ، وەك ژیـان ناوەستم لە ژین بەسـەربردن تییدا دەشزانم مەحاڵە هەر دەمرم.

لەوانەیە یـان بە پـیچەوانەوە ، سـەرت بسـوڕمیـت کە ئەم نـامەیە نـاودەنیم نـامەی خۆشەویستی . لەبەر ئەوەی لە پەیوەنـدی نیوانمانـدا

وشـەی خۆشەویسـتیمان بەکارنەهێنـاوە . لەوانەیە وشـەکانی ترمـان بەکارهێنابێـت ، وەك نزیـك بـوونەوە ، هـاوڕێیەتی ، ئاسـودەیی ، کە هەمـوو وشانێکن هیچ واتایەکیـان نیە ، بـی دەستنیشـانکردن ، واتـای وشـــەی ( ئاشـــنایی ) چـــیە کە جاریکیـــان بەکارمـــان هینـــا بـــۆ پەیوەنـدیەکەمان ؟ هـیچ واتـایەکی نـیە . خۆشەویسـتی ناگەیەنیـت . هەروەك بریتی نیە لە پیچەوانەکەشی ، بەڵکو تەنها هەستیکی نیوان خۆشەویسـتی و پیچەوانەکەیەتـی . ئەو ویسـتکە نیوەنـدەی نیـوان شتێک و هیچە .

کاتیك مرۆظ خۆشەویستی دەکات و نایکات ، تورِە دەبیت و نابیت ، قـین دروسـت دەکـات و نایکـات ، دەڵیـت و ناڵیـت ، و هەمیشـە گوریسـەکە لە نـاوەرِاسـتەوە دەگریـت . ئەو هەلویسـتە بیبـارە لە هەمـوو شـتەکاندا ، ئەوەی کە پزیشـکەکانی دەروونناسـی بە پیـرۆزی دادەنـین و ناویاننـاوە تەندروسـتی دەروونـی . ئەو تەندروسـتیە لای ئەوان بـریتیە لەوەی کە مـرۆظ نیـوە بیـت لە هەمـوو شـتەکاندا واتە مـافی هـیچ شـتێک وەك خـۆی نەدات ، ژیـری لە نیوەنـددا بیـت . هەروەها هەستی . خۆشەویستی مامناوەندبیت . قینـی مامناوەدبیت . ئاواتەکانی مامناوەندبیت . راستگۆیی مامناوەندبیت .

لەبەرئەوەش کە راسـتگۆیی مامناوەنـدی نـیە ئەوا پیویسـتە مـرۆظ کەمیك درۆ بکـات تـا لە روانـگەی پزیشـکەکانی دەروونناسیەوە ببیتە خـاوەن نازنـاوی خـاوەن دەروونیکـی و تەندروسـت . لەبەرئەوەی خۆشەویستیش وەك راستگۆیی مامناوەندی نیە لەبەر ئەوە وشـەی ( ئاشنایی ) هیچ واتایەکی نیە لە پەیوەندیدا .

پەیوەنـدی نیوانمـان چیە ؟ چـۆن سـەریهەڵدا ؟ ئایـا خـاڵی دەسـتپیکی هەبـوو ، یـا بە واتـایەکی تـر ئایـا لە یەکەمـین چـاوپیکەوتنەوە دەستپیکرد یان لە دوا چاوپیکەوتن یان لە نـاوەرِاستدا ؟ ئیستا من هەمـوو هیڵەکـانی بیـرم دەخەمەوە سـەر یەك تـا بیـتەوە یـادم بـزانم یەکەمین چاوپیکەوتنمـان کەی بـوو ، و روخسـارت لە پـیش چاومـدا

چۆن بوو . هەوڵیکە کە من ئیستا بە مەحاڵی دەزانم ، وەك هەوڵی بیرکردنەوەی بینینی دەموچاومە بۆ یەکەمینجار لە ئاوینەدا ، یان بینینی دەموچاوی دایکم یا باوکم . شێوە و روخسارانیك هەن هەر کە چاوەکانمان کەوتە سەریان وا هەست دەکەین لەگەڵمان بوون ، وەك ئەوەی بەشیك بن لیمان یان لە ناوماندا بن نەك لە دەرەوەمان .
ئایا تۆ یەکەمینجارت بیرە کە منت تیدا بینی ؟ کەی بوو ؟ لە نوسینگەکەت ، لە نوسینگەکەم ، لە ماڵەوەتان ، لە ماڵی من ، لە کیڵگە یان لە قەرەباڵخیدا کە سەرجەم رۆشنبیران کۆدەکاتەوە . ئەو روخسارانەی خەندە و دەموچاوپیکدادانەکانیان وەك یەکن ، لەتە بەرزەکان و ورگە زلەکان و تیرِوانینە بەرزەکان ، ئەو بەرزییە هەرچۆنیك بیت سور یا سەوز ، بە بەها یا بی بەها .
کاتیك لە چاوەکانت ورد دەبمەوە هەست دەکەم سەر بەم ئاستە نیت . لە چاوەکانتدا تیرِوانینیکی جیاواز بەدی دەکەم ، شتەکان جیادەکاتەوە ، کەمتر نەگوجاندنیان بۆ دەکات ، خەندە خەندەیە ، و دەموچاوپیکدادان دەموچاوپیکدادانە ، و روخسارت لەگەڵ ماسولکەکانی دەموچاوت جوڵەیەکی ئاسایی هەیە ، نایبینم ، و هەستیشی پی ناکەم ، هەرچەند بشزانم بوونی هەیە . وەك جوڵەی زەمەن و جوڵەی زەوی و فرِۆکە هەستی پیناکەم لەکاتیکدا لە ناویدام ، بەڵام دەزانم کە جوڵە هەیە .
هەندیك جار ئەو تیرِوانینە بوونی هەیە و من نوستووم ، یان لە شەقامدا لە رۆیشتندام ، یا دانیشتووم ، یا بەپیوەم ، یا سوار ئۆتومبیلەکەم بووم یا ماندووی ئیشم . و لە بەردەممدا زۆر سەیر ماویتەوە . لەو حاڵەتە دەرم دەکەیت کە تیایدا بووم ، و زۆرم لیدەکەیت لیچکدانەوەی بۆ بکەم ، و هۆکاری ئەو زۆرکردنەی بزانم و لە سەرەتادا هیمنانە پشتگویی بخەم ، پاشان بە تورِەیی ، دواتر سەر شیتانە .

جاریکیان زۆری لیکردم ، لە دڵی خۆمدا وتم لەوانەیە هەستکردن بیت بە تەنهایی . نوسینگەکەم قەرەباڵخە و ماڵەکەم قەرەباڵخە و قاهیرە قەرەباڵخە بەڵام ئیمە وەك ئەو شارە قەرەباڵخانە لە قەرەباڵخی و تەنهاییدا پیکەوە دەژین ، لە نیوانی هەردووکماندا گەرچی پیکەوە نوساوین دیواریکی ئەستوور هەیە . و ئەو دیوارە بەرز دەبیتەوە لەگەڵ بەرزبوونەوەی مرۆظ بە پلیکانەی کۆمەلاَیەتیدا .

لە شەویشدا کاتیك شار دەچیتە خەوی قوڵەوە ، بەدەوری خۆمدا وەك بیکەسێک یا هەتیویك دەسورِیم . رۆژژمیرە بچکۆلانەکەم دەکەمەوە ، چاوەکانم دەچیتە سەر ناو و ژمارە تەلەفۆنەکان . ناویکی زۆر و ژمارەیەکی زۆر بەدوای یەکدا بەپیی پیتەکان ریزبەندکراون ، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێک نیە ئەو تەنهاییە برِەوینیتەوە . ئەم شارە گەورەیە لەپیش چاومدا بەتاڵە لە پیاوان . لێوانلێوە لە نیرینە . یەکیکیان نیە ئافرەتیکی تەنها بدۆزیتەوە تا هەڵکوتیتە سەری . ژیان لە جیهانی ئیمەدا بۆ پیاو دروستکراوە . هیچ شتێکی وای تیدا نیە لەگەڵ ئافرەتیك کۆت بکاتەوە تەنها ئەو جۆرە نەبیت کە بەلای منەوە هیچ نیە ، و پیی خۆشحاڵ نابم ، و تەنها ناشرینیەکانی ژیان دەردەخات ، لە پیاویشدا تەنها کۆئەندامی سیکسی .

تاو نا تاویك زەنگی تەلەفۆنەکەم لیدەدات . جارجاریکیش داوەتی پیاویك قبوڵ دەکەم . غەریزی و حەزکردن بۆ دۆزینەوەی راستیەکان . حەزیکی کیومال بۆ ئاشکراکردنی ژیانی خەڵکی . هەوڵیك بۆ رەواندنەوەی تەنهایی. دەزانم مەحالە بتوانم لە ناخی خۆمدا بژیم . مەحاڵە مانەوەم بی خەڵکانی تر . گەر تەنها بۆ خۆمم بنوسیایە لە وشەکانمدا دەخنکام ، و گەر تەنها بۆ خۆم بدوامایە دەنگم دەگیرا ، و گەر بەردەوامیش لە روخساری خۆم ورد ببومایەتەوە مێشکم لە دەستدەدا .

لەگەڵ ئەوەشدا من بەردەوام لە دەست خەڵکانی تر هەڵدیم ، و حەزم بە خۆشاردنەوەیە دوور لییان . بەڵام ئەوە خۆ حەشاردانیکە لە چاوەکانیان و مانەوەیە لە بیریاندا ، ئەوە دوورکەوتنەوەیەکە لە پیناو نزیکبوونەوە ، دابڕانە لە پیناو پەیوەنیکردن . ئەمەشە نەهامەتیەکەم . ئەمەویت خودیکی تەنهای خۆم بم ، هاوکات دەمەویت بەشیکی دانەبڕاوبم لەوانی تر ، و ئەم نا تەباییە کوشتومی . دەمکاتە دوو بەش یان دووان ، یەکیك لەناو خۆمدا دوور لەوانی تر ، یەکیکیش لە دەرەوەی خۆم لە دڵی ئەوانی تردا . یەکیك بیدەنگ و جوڵە چاودیری جوڵەی ئەوی تر دەکات . من چاودیری ئەوی تر دەکەم یان ئەویتر چاودیری من دەکات ؟ کاممان بیدەنگین لە زەمەن و شوینی خۆمان و کاممان جولاَوە لەنیو زەمەن و لەسەر زەوی ؟

من سەرقاڵی وەلاَمدانەوەی ئەم پرسیارانە دەبم لە کاتیکدا کابرای خاوەن ئەم داوایە لەبەردەممدا بەبیدەنگی دانیشتووە ، ناوبەناو سەیریکم دەکات و چاودیری هەر جوڵەیەکم دەکات تا بمباتە سەر جیگەکە . کاتیکیش هیچی دەست ناکەویت سەری سوڕدەمینیت ، من تیکچووم یان وەك ئافرەتە کیویەکان حەزم بە سیکسکردنە بە بەکارهینانی هیز و هاتوهاوار.

ناتوانم نکوڵی ئەوە بکەم کە بیرۆکەی دەستدریژیکردن لای وەك خۆکوژییەك وایە . لە ناخیشمدا لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ ماوەییەك هەیە هەرچەند هەڵویست و بەرگریم هەبیت . بەڵام هەرگیز خۆم ناکوژم، و کەسیش ناتوانیت دەستدریژیم بکاتە سەر . هەرچەند ژیان ئاڵۆز و کوشندە بیت خۆم ناکوژم ، هەرچەندیش پیاو تا رادەی مردن حەزی هەبیت بۆم ناتوانیت . من وانیم وەك جاریك باسمکرد پیاو دەکوژم . بەڵام هەمیشە دەتوانم چاوم گیر بکەم لە چاوەکانی ، و ئەو ماسولکانە ببینم کە دەوروپشتی دەموپلیان تەنیوە هەڵدەلەرزن ، و پەنجەکانی دەستی بە دەستمەوە دەلەرزن .

لەوانەیە لەرزینیکی کەم بیت و بۆ ماوەیەك بیت ، بەڵام هیندە بەسە تـا ببییـنم ، و توانـای لەبەردەممـدا لە دەسـتبدات ، و توانـا ماسولکەییەکانی ، بەڵکو توانای سەرجەم پیاوانی جیهان ، نەتوانن ماسولکەکانی دەستم بنوشتیننەوە .

جاریکیان پیتوتم کە من ئافرەتیکی پتەوم . راستیش ئەوەیە کە من بەردەوام پتەو نیم . هەندیك جار دەستم شل دەکەم تا بنوشتیتەوە . هەندیك جاریش هەست بە ونبوون دەکەم وەك زەرِرەیەکی بچوك لە چنگی بونەوەریکی درِندە یان بەهیز و گەورە وەك قەدەر ، و هەست دەکەم کە توانای دروستکردنی هیچ شتێکم نیە بە ئیرادەی خۆم و لەسەر داوای خۆم ، توانای گرتنی راستیم نیە جاریکیان لەبارەی خەونەکانمەوە لیت پرسیم ، راستیش ئەوەیە کە من زوربەی کاتەکان لەگەڵ خەونەکانمدا دەژیم . خەونەکانمە کە توانای دەستنیشانکردن و گـۆرِانیـانم هەیە ، راسـتیش ئەوەیە کە ئەو گۆرِانم بەسەردا دینیت بی داوای خۆم . و واملیهاتوە راستیەکان نابینم گەر دریژکراوە و رەگی لە خەونەکانمدا نەبیت . دانت بۆ ئەوە پیادا دەنیم کە مێشکی شاراوەم بەهیزترە لە ئاشکراو باوم ، هەندیك جاریش ملکەچیم .

لە یەکیك لە خەونەکانمدا بینیمی . لەگەڵم لە جیگایەکی دوور لە خەڵکی دانیشتبوویت ، تەنها بوین ، شتێک کە لە واقیعدا لیمان بەسەر نەهاتووە . منیش لە نزیکتەوە دانیشتبووم ، لە ناخمدا جوڵەیەکی توند و لە سەر روکار و رووی سەریشەوە بیدەنگی و ئارامی ، جۆریك لە شادمانی شاراوەی خەمناك ، و ترپەیەکی بیدەنگ لە جەستەدا ، و حەزیکی لە رادە بەدەر ، حەزیکی هیندە پتەو تا رادەی حەزنەکردن بۆ هیچ شتێک . نەمدەزانی بە راستی چیم دەویست ، چاوەکانت بوو تا هەتایی لە چاوەکانمدا بمینیتەوە ؟ دەست و قۆڵەکانت بەرزبکەیتەوە و بمخەیتە ناخت بۆ هەتایی ؟ لە خەونمدا چاوەکانم بکەمەوە و لە تەنیشتمەوە بیت، و چاوەکانم داخەم

تا لیت رزگاربم بەڵام تۆ هەر لە نزیکم بمینیتەوە ، خەریکبیت بەرم بکەویت و نا ، خەریکبیت جیمبهیڵیت و نا. بۆچی ؟ بۆچی جیت نەدەهیشتم ؟ ئایا لە نیوانی من و تۆدا شتێکی بەزۆر هەبوو ؟ کەسێک زۆری لیکردیت ؟ یان کەسێک زۆری لیکردم . دەزانم کە کەس نیە . بیگومان هیچ کەسێک نیە . لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم بڵیم کە بە ویست و ئارەزووی خۆم دیم بۆلات ، یان پەیوەندیم لەگەڵت نەسەپینراوە بەسەرمدا ، وەك هەوا دەچیتە سنکمەوە و دەردەچیتەوە ، یان خوین کە بە دەمارەکانمدا هاتوچۆ دەکات .
ئەم بەشە خۆنەویستە لە پەیوەندیم لەگەڵت یاخیم دەکات ، لەبەر ئەوەی من ئازادیم دەپەرستم . ئەوەشە هۆکاری شۆرشکردنم بەسەرتدا ، هەندیکجار دەڵیم چیتر لەم جارە بە دواوە ناتبینمەوە ، یان دەمەویت خاڵە لاواز و هەڵەکانت بۆ کۆبکەمەوە ، لەوانەیە تۆمەتبارت بکەم وەك چۆن پیاوانی تر تۆمەتبار دەکەم . بەڵام هەمیشە شۆرِشیکی شکست خواردووە ، لەو شۆرِشانە دەکات کە بەسەر خۆمدا ئەنجامیان دەدەم ، و حەزم بەوەی کە زۆرجار دەمەویت جەستەم لە پەنجەرەکەوە بخەمە خوارەوە و رزگارم بیت لە دەستی ، و هەمیشەش ئەنجامەکە یەکە . ئەویش ئەوەیە کە بەردەوام جەستەم پەیوەستە پیوەم لەسەر کورسیەکە، و تۆش لەبەردەممدا لەجیی خۆتی ، و لە نزیکمی خەریکە دەستم لیدەدەیت بەڵام دەستم لی نادەیت . بۆچی ؟ بۆچی هەرگیز دەستت لی نەدەدام ؟ ئایا تۆ تەنها سیبەریکیت ؟ یان بونیکی راستەقینەت هەیە ؟
هەندیك جار کاتیك تا دەرگاکەت دەگەیاندم هەستم دەکرد جوڵەیەکی خێرای دەستەکانت هەیە ، یان قۆڵەکانت لە کەمەرم ، جوڵە نەبوو ، بەڵکو بەرکەوتنیکی خێرای ناسك بوو ، زۆر کەم و کورت . بەڵکو لەوانە بوو بەرکەوتنیش نەبیت ، لەبەر ئەوەی بەردەوام ماوەیەك هەبوو لە نیوان دەستەکانی تۆ و جەستەم . ماوەیەکی کەم هیندەی تاڵە موویەك ، بەڵام بەس بووە بەردەوام بۆ جیاکردنەوەمان ،

بەردەوام لەخۆمم دەپرسی کە ئایا ئەمە راستەقینەیە یا خەون ؟ بۆ بەردەوام ئەم ماوەیە هەیە ؟ ئایا بریتیە لە ترسم لیت ؟ یا ترسی تۆیە لە من ؟ ئەی ئایا هیچی وا هەیە ترسی هەبیت ؟ .

جاریکیان ویستم ئەو خەونە بڕەوینمەوە و راستیەکان بەدەست بگرم و هەستی پیبکەم . داواتم کردی بۆ مالەکەم ، میژووەکەت بیرە ؟ لە دەنگکتدا جۆریك لە ترس و دلەراوکی و لەرینەوەیەکم هەست پیکرد . نەهاتی . منیش لیم نەپرسیت بۆچی . دەمزانی وەك خۆم وایت و بەردەوام دەتەویت بە هەلواسراوی لە نیوان خەون و راستیەکان بمینیتەوە .

ئایا شتێک هەیە گومان بڕەوینیتەوە ؟ ئایا بەلگەیەك هەیە لەسەر شتێک؟ هیچ خالیکی وا هەیە لە نیوان من و تۆدا بتوانم بیگرم ، وشەیەکیش نیە شیاوبیت ، زمانیك نیە ، جولەیەك نیە ، بەرکەوتنیك نیە ، هیچ شتێک نیە لە نیوانماندا هەر شتێک دوپاتکاتەوە . بەلام تەنها شتێک هەیە من بڕوام پییەتی ( کە ئەویش ناتوانریت بسەلمینریت ) ، ئەوەش ئەوەیە کە تۆ هەمان هەستت هەیە بۆ من وەك من هەمە بەرامبەرت ، و بە هەمان قەدەر ، و هەمان شیواز ، و لە هەمان ساتدا . ئایا من هەلەم ؟ لەوانەیە و لەوانەش نیە .

هاوڕێم من بەردەوام ئاوام . لیت نزیك دەبمەوە و دووردەکەومەوە . دەردەکەوم و ون دەبم . هەنگاو دەنیم بەرەو پیشەوە و پاشەکشی دەکەم سور دەبم لەسەر بەرەنگاربونەوە و هەلدیم . و رۆژ بەدوای رۆژ دەڕوات ، مانگیش لە دوای مانگ ، بیست مانگ یان زیاتر . پیت وتم رۆژگاری ژیانم تیدەپەڕیت ، و ئەو رۆژەشی دەڕوات ناگەڕیتەوە . و من تەمەنم بە فیڕۆ دەدەم لە پیناو گەڕان بەدوای مەحالدا ، یا بەدوای سەلماندندا ، و هیچ کەسێک چاوم پڕناکاتەوە جگە لە خوا . من ئەو رۆژە چاوەکانم لەودیو چاویلکەیەکی گەورەوە دەشاردەوە ، و داوات لیکردم چاویلکەکە داگرم و دامگرت ، و چاوت بڕییە چاوم ، خەریك بوو دان بەوەدا

بنـــیم کە تـــۆ لە ژیانمـــدا خەون و راســـتیەکانیت . بەڵام زەنگـــی تەلەفۆنەکە لیبدا ، یا زەنگی دەرگا ، یا جوڵەیەك روویدا . لەوانەیە یەکیـك لە منـداڵەکانت سـەرەتاتکییەکیان لیکـردبین . لەوانەیە تـۆ بە جـوڵەیەك رووت لـی لادابـم ، لەوانەیە سـەریکت جـولاَنـدبیت ، دەسـتیکت ، وا هـات بە خەیاڵمـدا کە سـەیری کـاتژمیر بکەیـت . جوڵەیەکی خێرا ، بە ئەنقەست یان بەنا ئەنقەست ، تەنها چرکەیەك یا نیوەی چرکەیەکی خایاند ، بەڵام هیندە بەس بوو بۆ پچرِاندنی تاڵە مووی حەریری ناسکی سەر هەستکردن بە راستی .

جاریکیان پیتوتم کە من لە ژیان هەڵدیم ، و خۆشەویستی نازانم ، و توشی نەخۆشی سەردەم بووم و پیویستم بە چارەسەر و دەرمان و لەو بابەتـانە هەیە . سەرمسورِمـا و تیرِامـام . نـیگەران بـووم بۆخـۆم و بە پیچەوانەوە ، وام لیهات هەست بە نەخۆشیەکە بکەم و دەرمانی کۆتایی سەدەی بیست بخۆم . جاریك یان زیاتر لیت پرسیم بۆچی ئەو دەمانانە ناخۆم وەك هەموو ئەو رۆشنبیرانەی تر ؟ بەڵام هـاوڕێم مـن سـەر بەم سـەدەیە نـیم و لەو رۆشـنبیرانەش نـیم و وەك ئەوان رۆژنامەکـان نـاخوینمەوە . بمەویـت و نەمەویـت چاوەکـانم دەنـوقین هەرکە رۆژنامەکانیـان بەدیکـرد ، گویکەکـانم دادەخـرین هەرکە دەنگـی هەواڵەکـان بەرزکـرایەوە ، کـاتیکیش بەشـەقامدا دەرِۆم روخسـارەکان نـابینم ، بەلای خەڵکیەوە وەك کەرِ و کویر وام بەڵام هـاوڕێم مـن نە کەرِم و نە نابینـا . مـن هەمـوو روخسارەکان دەبینم کە بە بەردەممدا دەگوزەرین ، و سەرجەم پیتـی دیـرِەکـانی سـەر زەوی دەخـوینمەوە ، و گویشـم لە هەر تـرپەیەکە گەر تەپەی میـرووله بیـت یـان تـرپەی دڵیـك لە سـنگی منـداڵیکی هەتیودا . تۆ وا دەزانیت ورِینە دەکەم ؟ هەست دەکەیت نابینـابم ؟ بەڵام من جاریکیان تۆم بینی لە گۆرِەپانی تەحریر . ئوتومبیلەکەت خێرابوو ، ماندویتی بە دەموچاوی تۆو هەموو دەموچاوەکانی ترەوە دیاربوو ، وچاوەکانی تۆ و هەموو چاوەکانی تریش خەمبارییان پیوە

دیاربوو . قەرەباڵخیەکی زۆر هەبوو ، جەستەکان و ئوتومبیلەکان پیکەوە نوسابوون ، و هەوا تەنگ و کەم بوو ، هەموو هەناسە بڕکییان پیکەوتبوو لە عەرەق و قەرەباڵخیدا هاواری فریاکەوتنیان دەکرد . بەڵام کەس کەسی نەدەبینی ، و کەسیش فریای کەس نەدەکەوت .

سەرباری ئەو هەموو قەرەباڵخیە توانیم روخسارت ببینم ، نە روخسارت روخساری تۆ بوو و نە چاوەکانت لەخۆم پرسی ئاخۆ ئەو بیت ئەو نەبیت. بەخێرایی ئاوڕیکم دایەوە بۆ دوای خۆم . بەڵام ئوتومبیلەکەت چوبوە نیو قەرەباڵخیەکەوە و توانیم ژمارەکەی بناسمەوە . تیرِامام و لەخۆمم پرسی لەکویوە هاتووە و بۆ کوی دەچیت و بۆ ئاوا خێرایە ؟! دەمزانی لە نوسینگەکەت بویت و دەرِۆیشتیتەوە بۆ ماڵەوە ، یان ئیشیکت هەیە لەگەڵ گەورەیەك یان بچوکیك ، لەگەڵ نەخۆشیك یان ساغیك . من هەموو ئەوانەم دەزانی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەجیگەی خۆم بە سەرسورِماوی مابوومەوە وەك ئەوەی هیچ نەزانم .

پاشان جاریکی تر بەرِیگەی خۆمدا رۆیشتم . سەر و دڵم قورس ، خەمۆکیەکی سارد باڵی کیشابوو بە سەرمدا ، و پرسیاریکی بی وەلاَم : بۆچی ئەم هەمووە ؟ و لە پیناوی چیدا ؟ ئایا راکردنە بە دوای پارەدا ؟ ئایا هەوڵدانە بۆ دەستکەوتی دەسەلاَت ؟ ئایا گەرِانە بە دوای ناوبانگدا ؟ بەڵام تۆ لە هەموو ئەمانە زۆرت هەیە ، ئیتر چیە ؟ ئایا خۆشەویستیە ؟ بەڵام ئایا خۆشەویستی دەتوانیت روخسارەکان ماندوو بکات و چاوەکان خەمبار و نیگەران ؟.

هەستم کرد قینم لەم شارەیە ، قینم لەو روخسارو دەموچاوانەشە ، قینم لە میلی کاتژمیرە ، و لە هەموو شتێک . لە زۆری قینم هەوڵمدا چاوەکانم و گویچکەکانم و هەموو بۆشاییەکانی جەستەم دابخەم .

حەزیکی بی سنوور بۆ راکردن و دوورکەوتنەوە لە هەموو شتێک . حەزیکی بی سنوور بۆ جیابوونەوە لە کەون بە ریژەی مردن .
بەڵام حەزم بە هیچ شتێک نەدەکرد ، روخسارتم لە قەرەباڵخیدا لی ون ببیت ، و چاوەکانتم لەبەرچاو ونبیت لە زەمەندا . هاوڕێم تۆ دەزانیت من هیچم لەتۆ ناویت . چونکە من دەخۆم و دەخۆمەوە و دەخەوم و سیکس دەکەم ، ئوتومبیلیکی وەك ئەوەی تۆ لیدەخورِم ، بەڵام من نامەویت لەم تەنگەژەیەدا لیم ونبیت . ژیان لە پیشچاومدا بی تۆ وەك فیلمیکی بیدەنگی بی رەنگە ، تەنها رەش و سپی . بەڵام هەموو شتێک لەگەڵ تۆدا دەگۆرِیت و رەنگەکان دەگەرِینەوە و هەموو شتەکان رەنگاورەنگ دەبن وەك پەلکە زیرِینە .
لەم ساتەدا دەمەویت بە پەنجەکانم دەستت بگرم ، گەر هەموو تەمەنم ببیتە پەنجەی ناسك و بەسۆز تا دەست لە روخسارت بدات . گەر جەستەم ببیتە ملیۆنان پارچەی ورد و ماندویتی لە چاوەکانتدا بەرِەوینیتەوە . ئایا دەشیت دوای هەموو ئەمانە بە بیدەسەلاَت لە خۆشەویستی تاوانبارم بکەیت ؟ ئایا دەبیت جاریکی تر پیم بڵییت کە من تیناگەم و ژیر نیم ؟ ئایا دەتوانیت کەمیك لیم تیبگەیت ، یان کەمیك تیتبگەم ؟ خوازیارم ، بەڵکو پیویستە !.

# روپۆش

لەپڕ بەئاگا هاتمەوە خۆمم بینی دانیشتووم و بتڵێك مەیم لەبەردەمدایە کەمیکی تیادا ماوە ، لەگەڵ تەپڵەکیکی جگەرە پڕە لە قنچکە جگەرەی کوژاوە کە پیشتر نەمبینیبوو ، بەڵام دەستبەجی بیرم هاتەوە کە قنچکە جگەرە نویکەی خۆمە کە ماوەی سی بۆ چوار ساڵ دەبیت دەیکیشم .

سەرم لەسەر تەپڵەکەکە بەرزکردەوە پیاویکم بینی کە پیشتر نەمبینیبوو. رووت بوو تەنها جلیکی حەریری کراوەی لەبەردا بوو سنگیکی مودار و دوو رانی موداری هەبوو . پانتۆڵیکی خەتخەتی تەسکی لەبەردا بوو بە گۆشتەکەیەوە نوسابوو . چاوە گیژەکانم بۆ دەموچاوی بەرزکردەوە . زانیم کە پیشتر بینیومە ، کەمیك چاوم برِییە چاوی و خەندەیەکی کرد . خەندەیەکی سەیر ، لەخۆیەوە ، و خێرا وەك خێرایی تیشك ، یان وەك خێرایی تەزووی کارەبا کە جیگەی سەرسورِمانە ، وەك سەرسورِمانی لەمیژینەی مرۆظ لە گەرِان بە دوای خوادا یان ئاسودەیی . بۆچی ئەو کەموکورتیە لە کەون و لە جەستەی مندا رووبدات بە تایبەت لەو ساتەدا ، لەگەڵ ئەوەی چاوەکانم رۆژانە چاوی بە هەزاران لە چاوەکان دەکەویت ، و کەون و جەستەشم وەك خۆیەتی ، وەك سەرسورِمانی لە میژینەی مرۆظ ، بەڵام هەر زۆر زوو رەویەوە و کەون گەرِایەوە جیی خۆی ، هەروەها جەستەم ، و ژیان وەك رۆژان

دەر ِوات ، سی بۆ چوار ساڵ لەمەوبەر کاتیك بۆ یەکەمینجار بینیم . و خەریکە بیرم دەچیتەوە لە سەرقاڵی کار و خەڵکی و ماڵدا .
جاریکی تر چاویکم گیر ِا بە جەستە رووتەکەیدا و سنگ و رانە مودارەکەی . ئەو دەموچاوەی سەیری جەستەی پی دەکەم هەمان ئەو دەموچاوە نیە کە لە دەموچاوی پی دەر ِوانم . چاوەکانیتی کە دەمبەستیتەوە پیوەی . سەرسور ِمان و تیر ِامان دەر ِەویتەوە و پەیوەندیم پیوەی دەبیتە پەیوەندیەکی راستەقینە لەنیو زۆریك لە پەیوەندیە نا راستەقینەکان ، سی ساڵ و لەوانەیە چوار ، و لە هەموو جاریکیشدا بەڕێکەوت یا لە شەقام یان لە نوسینگە یا لە ر ِیر ِەویکدا دەیبینم و کەمیك رادەوەستم تا سەرسور ِمانیك و تیر ِامانیك دەمگریت ، پاشان دەر ِۆم و دەزانم کە پەیوەندیەکی زۆر سەیرە ، هاوکات ئاسایی و شیاوە لە چاو زۆریك لە پەیوەندیە نا شیاو و نا ویستراوەکاندا .
کاتیکیش کە وامان لیهات بە شێوەیەکی ریك و پیك و شێوە گونجاویك بە یەك دەگەیشتین پەیوەندیم نەگەیشتبووە هیچ ناوچەیەکی جەستەی جگە لە چاوەکانی . چەندین کاتژمیر بەیەکەوە دادەنیشتین و قسەمان دەکرد بێئەوەی چاوەکانم لە چاوەکانی بتروکین . جۆریك لە بەیەکگەیشتنی مێشك . چیژیکی هەبوو ، بەڵام بەردەوام ئەوچیژە شتێکی کەم بوو . ئەو شتە چیە ؟.
لەخۆم پرسی : لەوانەیە حەزی بە یەکگەیشتنی جەستەکان بیت ؟ بۆ نا؟ ئایا لە کۆتاییدا ئەو پیاو نیەو من ئافرەت ؟ ئەم بیرۆکەیەم لا نوی بوو بەڵکو سەیر بوو . و حەزیکی سۆراخکردنیکی سەیر دایگرتم . ئایا بەیەکگەیشتنی جەستەی من و ئەو چی دەگەیەنیت ؟ حەزیکی توند بوو لە حەزی خۆشەویستی بەهیزتر . لەوانەیە هەندیکجار پاڵم پیوەنیت بۆ بەیەکگەیشتنیکی بی خۆشەویستی تەنها بۆ تیرکردنی ئەو حەزە ، و لە هەموو جاریکیشدا هەستم بە قیزەونی دەکرد و

مێشــکم دڵنیـا دەبـوەوە لەوەی کە جەسـتەم تەنهـا لە یەك حاڵەتـدا بە جەستەی پیاو دەگات ، ئەویش حاڵەتی خۆشەویستیە .
مـن هۆکـاری ئەو قیزەونیەم دەزانـی . بریتیە لە نەویستنیکی ئاسـایی هیچ پەیوەندیەکی نیە بە جەستەوە بەڵکو پەیوەندی بە میژووەوە هەیە . هینـدەی پیـاو فیـزی بە نیـرینەییەوە لیداوە هینـدە ئـافرەت نەفرەتـی لیکردووە . نەفرەتکردنی ئافرەت روکارەکەی تری پەرستنی خـوای نیرییە. هیچ هیزیکیش نەبووە لە جیهاندا توانیبیتی نەفرەتـی ئافرەت بسرِیتەوە تەنها سـەرکەوتنی خۆشەویسـتی نەبیت بەسـەر خـوای نیریدا ، و میژوو دەگەرِیتەوە بۆ پیش شەش هەزار ساڵ لەمەوبەر ، کاتیك خوداوەند میینە بووە . ئایا خۆشەویستی سەرکەوتن بەدەست دەهینیـت ؟ ئایـا دەبیـت پەیوەنـدی نیوانمـان خۆشەویسـتی بیـت ؟ نەمدەزانی . بەڵگەم لانەبوو . ئایا خۆشەویستی بەڵـگەی هەیە ؟ ئەو حەزەی هەنـدیکجار دەدات بەســەر ژیــانی قەرەبــاڵخم دەتــوانم لە چاوەکانی برِوانم ؟ وەك کەسێک وایە تـاو نـا تاویك دەچیتە سـەر ئاویکی پیرۆز ، چۆك دادەدات و نـویژ دەکات و دەگەرِیتەوە . من چۆکم دانەدەدا و نـویژم نەدەکرد ، و دان بە هیچ خوداوەندیکدا نـانیم جــگە لە مێشــکم و ئەوەی لە ســەرمدایە . چــی رایدەکیشــام بــۆ چاوەکانی ؟
ئایــا خۆشەویســتی ئەفســانەیەکە وەك ئەفســانەی ئــادەم و حەوا و ســەندریلا و شــاتر حەســەن ؟ ســەرجەم ئەفســانەکان کەوتــن و روپۆشەکانیان هەڵماڵرا. روپۆشیکی زۆر لەبەردەم مێشکمدا کەوتنە خــوارەوە و گەورە بــوون ، و لەگەڵ کەوتنــی هەر روپۆشــیکیش شەوانە دەگریام بۆ ئەو خەیاڵە جوانەی لەناوچوو . بەڵام لە بەیانیانـدا چاوەکـانم دەبینـی بە فرمیسکەکان شـۆرابونەوە وەك چۆن ئاورنـگ پەرِی گـوڵ و یاسـەمین دەشـواتەوە . و ئـاوینەکەم جیدەهیشـت و بەســەر روپۆشــە کەوتووەکــانی ســەر زەوی دەرِۆیشــتم ، بە توانایەکی زۆرەوە کە لە پەستانی دوینی بەهیزتر دەبوو .

پیکی دەیەم یان بیستەمی بۆ پڕکردم . کەمیك دەستم لەرزی کاتیك پیکەکەم گرت . بەڵام خوداوەندەکەی ناو سەرم دانیشتووە بە جیگیری وەك ئەبولهەول جوڵەی نیە ، هیشتاش چاوەکانم لە چاوەکانی برِیوە لەگەڵ ئەوەی زانیم کە نە پانتۆڵەکەی و نە کراسە حەریریەکەی لەبەردا نەماوە .

هەستم کرد پیستی سپیە ، و کەمیك سوری پیوە دیارە ، کە هیمای خاوینی و خواردنی پاك و باشی رۆژانەیە ، چاوەکانم هەر لە چاوەکانیدا بوو بەڵام پاش کەمیك بە دەستەکانی سەری خوار کردمەوە تا چاوم بکەویتە سەر جەستەی .

جاریکی تر بە دوو چاوی 6/6 وە سەیرم کرد ، جاریکی تر هیز و توانا و خاوینی و خواردنی باشم هەست پیکرد . خەریك بوو رای خۆم دەربرِم بۆی سەبارەت بەو هەستەی بۆ خاوینی و توانا و خۆراکی هەمە .

بەڵام چاوەکانم بەرزبوونەوە و گەیشتنەوە بە چاوانی . نەمزانی ئایا بە سەرسورِمانەوە لیم دەرِوانیت ، یان سەرسورِمان لە چاوەکانی مندایە . بە خۆمم وت لەوانەیە ئەوە هەڵویستیك بیت پیویستی بە سەرسورِمان بیت، کاتژمیر لە سیی بەیانی تیپەرِی کرد ، بتڵی مەیەکە بەتاڵ بوو ، ماڵەکەش کەسی تیادا نیە ، جیهانیش لە دەرەوە بیدەنگ و مردوو لە هیچەوە . ئیتر چی جەستەی من و ئەو لیك دەکاتەوە !؟

کاتیك لامکردەوە بەلایدا بینیم دانیشتووە و جلەکانی لەبەر کردۆتەوە و پشتینەکەشی بە توندی لە کەمەری بەستووە ، سنگی و رانەکانی شاردبۆوە ، و تەنها سەری و ملی و قاچەکانیم لە نەعلیکی سەر جیگەدا دەبینی . لە بەشیکی دەموچاوی ماندویتی دیارە ، وەك ئەوەی لە ناکاو ماندوو بوبیت ، کەمیك روخساری داکەوتبوو ، وەك منداڵیك بیەویت بنویت دوای شەونوخونیەکی زۆر . دەستم دریژکرد

وەك دەستی دایك كە دیت بەسەر دەموچاوی منداڵدا بە دڵیكی پڕ سۆزی دایكایەتی بۆ سەر دەموچاوی .
چووم سەر شەقام ، دەموچاوی گەرمم دا بەدەم شەماڵی ساردی بەرەبەیان . هەستیكی شاراوەی خۆش تیكەڵ بە هەستیكی سەیر بە نیگەرانی . سەرم خستە سەر سەرینەكەم . چاوەكانم كراوە پڕ فرمیسك . مێشكم سەردەكەویت بەسەر مەیدا ، تا سەرم دەسپیرم بە سەرینەكەم و مەی سەركەوتن بەدەست دەهینیت و نیگەرانی سەردەكەویت بەسەر شادمانیدا.
كاتیك بۆ رۆژی دوایی چاوەكانم هەڵهینا مەی رەوییبوەوە و تارمایی پیشی چاومی چۆڵكردبوو . لە ئاوینەكەدا سەیریكی چاوەكانم شۆراوە بە فرمیسك كرد ، خەریك بوو وەك هەموو جاریك ئاوینەكە جیبهیلم و پی لە سەرجەم روپۆشەكان بنیم لەژیر پیمدا و بەسەریاندا بڕۆم . بەڵام لەجیی خۆم نەجوڵام . جەستەم نوشتایەوە و روپۆشیكی هەڵگرتەوە لەسەر زەویەكە ، و جاریكی تر خستمەوە سەر دەموچاوی .

# دانپیادانانێكی پیاوانە

پێكێكی ترم بۆ پڕكە لە مەی ، لەگەڵ سەهۆڵیكی زۆر ، و لێمگەڕی با قسە بكەم و پیم مەبڕە . دەتوانیت ناو بە ناو دەستێك بهێنێت بەسەر سەرم یا سنگم یان هەر جیگەیەكی جەستەم بەڵام قسەم پیم مەبڕە . لەبەرئەوەی من ئەمشەو هاتووم تاكو دان بنیم بە هەموو ئەو شتانەی كە هەرگیز بۆ كەسم باسنەكردووە و دانم پیدا نەناوە تەنانەت گەر نوینەری خواش بیت لەسەر زەوی .
ئەوی راستی بیت من بڕوام بەو نوینەرانە نیە ، و قینم لە هەر نیوەند و نوینەریكە لە نیوانی من و خوادا . ئەمە واتای ئەوە نیە كە

خۆم بە گەورە بزانم ، یان کەسێکی خۆ پەرست بم ، یان پەیوەندیم لەگەڵ خەڵکی بە جۆریك بیت ، پیچەوانەی ئەمانە راستیەکەیە . بەڵکو من سادە و ساکار و بەخشندەم بۆ هەموو خەڵکی و بەزەییم بەخۆمدا دیتەوە وەك یەکیك لەو کەسانە .
بەزەیی هاتنەوەم بەخۆمدا سنووری بۆ نیە ، لەبەرئەوەی خۆمم خۆشدەویت ، و دان بەوەدا دەنیم بۆت کە خۆشەویستی راستەقینەم بۆ خۆمە . لەو ساتەوەی لە دایك بووم خۆمم خۆشویستووە ، چاوەکانی بریسکانەوە کە بە باوکمی وت : کورە / نیرینەیە . نیرینەییم خۆشویستووە ، و هەر لە سەرەتاشەوە زانیومە کە هۆکاری جیاکردنەوەمە، لەسەرم پیویست بوو بەردەوام بوونی بسەلمینم ، و ئاشکرای بکەم ، بۆ خەڵکی دەربخەم بە شێوەیەکی حاشا هەڵنەگرانە کە هیچ جۆرە گومانیك لای کەس نەهیڵیت .
رۆژیکیان ، کە منداڵ بووم ، لە نزیك باوکمەوە وەستابووم لە شەقامەکەدا، کاتیکم زانی قاچیکی گەورە پیی نا بە پەنجەکانی قاچمداو لەتاو ئازار هاوارمکرد : ( ئای ! ) باوکم بە تیروانینیکی لە خۆبوردوەوە سەیریکی کردم و بە دەنگیکی گرەوە وتی : ( پیاو هەرگیزناڵیت " ئای " ) ، لەو رۆژەوە نەموتووە ( ئای ) هەرگیز . من هەستم بە ئازار و فرمیسك دەکرد یان کاتیك کەسێک لیی بدامایە ، و ماسولکەکانی پشتم و ملم گورج دەکردەوە و دەموت : من پیاوم .
جاریکیشیان پزیشکیك بە نەشتەرەکەی بە ئارەزووی خۆی لە قاچمدا ئیشی دەکرد تا پارچەیەك شوشەی لی دەربکات ، هەستمکرد گۆشتەکەم دەپچریت و خوینم دەروات ، و لە زۆری ئازارمدا نوقمی دەریایەك عەرەق بووم ، نەموت ( ئای ) . ئەو شەوە دوای ئەوەی هەمووان و منیش نوستین بینیم لە خەونمدا دەگریم و بە چرپە لەبەر خۆمەوە دەڵیم : ( ئای ! ئای ! ) تا بەیانی .

کاتیکیش من و هەمووان هەستاین ماسولکەکانم گورج کردەوە و خۆم گۆرِی و بە شادمانیەکەوە دەموت : ( من پیاوم ! ) چی دەڵییت خانمەکەم؟ قاچم و پەنجەکانم وەك پەنجەکانی تۆ نەرمە . ئەمە راستە ، چونکە من سەر بە چینی ناوەرِاست و بی ماندووبوەکانم ، بە واتایەکی تر بۆرجوازی ، و پەنجەکانم تەنها بۆ گرتنی پیکی مەی بەکاردەهینم ، یان بۆ ئیمزاکردن لەسەر ناوەکەم لەسەر هەندیك مامەڵە لە نوسینگەکەم ، یان بەرزکردنەوەی دەستم بۆ هەندیك لە هاورِێکانم ، و هاورِێکانیشم وەك دەزانیت زۆرن ، و من هەموویانم خۆشدەویت وەك چۆن هەموو خەڵکیم خۆشدەویت کەواتە من کەسم خۆشناویت . ئەمە واتای ئەوە نیە کە قینم لییان بیت ، بەڵکو بەردەوام من سەرقاڵم . و هەمیشە نوقوم بووی خۆشەویستی خۆمم . و هەمیشە ئامادەم بۆ بەرگریکردن لەخۆم ، و بە هەر ریگەیەك ، تەنانەت گەر تاوانی کوشتنیش بیت .
بەو شێوەیە سەیرم مەکە وەك ئەوەی یەکەمین تاوانبارِبم لەم سەر زەوییە . تاوان لە ژیانی ئیمەی پیاواندا پیویستیە . تەنها ریگەیە بۆ ئەوەی بیسەلمینین کە پیاوین . و لەبەرئەوەی کە تاوان پیویستی بە دەسەلاَت و بویری هەیە ئەوا من ناتوانم ببمە تاوانبار . و تەنها خەونە زیندووەکانم لەبەردەمدایە پەنای بۆ ببەم ، و خۆم بە پاڵەوانیکی بی وینە بیتە پیش چاو ، و سەرەکان لە جەستەکان جیادەکەمەوە بە پیاکیشانیکی شمشیرەکەم . ئیمەی پیاوان خۆشحاڵین بە بکوژەکان ، و پیاویك نیە لە ئیمە بە بکوژیك خۆشحاڵ نەبیت گەر قینی لیی نەبیت . ئەمەیە ئەو هەستەی من هەستی پیدەکەم کاتیك لە نیو پیاوانیکی گرنگ و بە دەسەلاَتدا خۆم دەبینمەوە ، هەربۆیە هەڵدیم لە دانیشتنی پیاوانی بەرِێز و هەست بە حەوانەوەیەکی دەروونی دەکەم لە دانیشتنەکانی پیاوە بیرِێزەکاندا . بەڵام بەشێوەیەکی گشتی من دانیشتنەکانی ئافرەتانم پیخۆشترە . لەبەرئەوەی ئافرەت چەند بەرزبیتەوە من هەر زاڵم بەسەریدا

بەهۆی نیرینەییم . چی دەڵێیت ؟ تکات لیدەکەم پیم مەبرِە و پیکیکی ترم بۆ پڕکە لە مەی ، و سەهۆڵیکی زۆریشی تیکە ، و لیم گەرِی با کەمیك باری شانم سوك بکەم لەو تاوانانەی قورسیان کردووە .
درۆت لەگەڵ ناکەم ، تاوانەکانم هەمووی مرۆظانەیە ، لەبەرئەوەی تەنها یەك ئامانجیان هەیە ، کە سەلماندنی پیاویتیمە . و پیاویك لە ئیمە ناتوانیت پیاویتی خۆی بسەلمینیت بە سەرکەوتنی نەبیت بەسەر پیاوانی تردا . بەم شێوەیە چارم نەمابوو جگە لە چوونە ململانیی هەتایی نەبیت . ململانی لەگەڵ هەر پیاویکی جگە لەخۆم ، لە ژووری کۆبونەوەکان ، یان لە ژووری نوستەنەکە ، ململانی یەکە گۆرِانی بەسەردا نایەت . لەبەرئەوەشی کە بویریم نەبوو لە ژووری کۆبونەوەکان تەنها ژووری نوستنەکەم بەدەستەوە مابوو .
پیم مەڵی کە گورگم یان راوچی ئافرەتان ، لەبەرئەوەی من پیاویکم خیزانم هەیە ، هاوسەرەکەمم خۆشدەویت وەك چۆن دایکمم خۆشویستووە . ئەو جۆرە خۆشەویستیە رۆحیە پیرۆزە ، بە واتایەکی تر ئەو خۆشەویستیەی هەموو شتێکی لی وەردەگرم و هیچی پینادەم ، ئەوەشە خۆشەویستی نمونەیی . هاوسەرەکەم تاکە کەسە ( و پیش ئەویش دایکم بوو ) کە دەمتوانی لەگەڵیان تورِە ببم، و سەربەستانە لیی نیگەران بم . هۆکارەکەش زانراوە ، لەبەرئەوەی ناتوانیت بە تورِەبوونیکی بەرامبەر وەلاَمم بداتەوە ، ئیمەی پیاوان ناتوانین قینمان لەبەردەم ئەو کەسانە دەربرِین کە توانای تورِەبوونیان هەیە لیمان . هیچ کاتیك لەبەردەم سەروخۆم تورِە نەبووم ، بەڵام زۆر خێرا لەبەردەم دایکمدا هەڵدەچم و تورِە دەبم . لەبەردەم هاوسەرەکەم تورِە دەبم و جوینیش دەدەم سەربەستانە ، هەروەها لەگەڵ منداڵەکانم . هەموو ئەوانە من نانیان دەدەم و بەخیوکاریانم و گەر لیم تورِە ببن ئەلتەرناتیفیکیان نیە بۆم .

ئەوەشە ئامانجی بەهاوسەری بوون ، ئیتر چۆن پیاویك دەتوانیت تورەبونەكانی دەربرِیت بی پیكهینانی ژیانی هاوسەریتی ؟ لاواز ترین پیاو لە هەرە ئاستە نزمەكانی كۆمەڵگە لە كۆتاییدا دەگەرِیتەوە بۆ هاوسەرەكەی تا تورەبیت و هەست بكات پیاوە . چی دەڵییت ئازیزەكەم ؟
تۆ بە هاوسەری بوونت رەتكردەوە لەبەر ئەو هۆكارە . تۆ ئافرەتیكی ژیری . هەست ناكەم كە ژیریت بیت پەلكیشم بكات بۆ ناو جیگەكەت بەدەر لە هەموو ئافرەتانی سەر زەوی . تیناگەم بۆ بە تەنها بۆتۆ دان بە شتەكاندا دەنیم وەك چۆن مرۆظ لەبەردەم خوداوەندەكەی دان بە شتەكاندا دەنیت ؟ درۆت لەگەڵ ناكەم . ئەوە خۆشەویستی نیە . چونكە من وەك چۆن پیشتر پیموتی هەر لە سەرەتاوە كەوتومەتە خۆشەویستی خۆم و كۆتایی پیهات .
هۆكارەكەش ئازیزەكەم ئەوەیە كە تۆ تەنها كەسیت پیویست ناكات پیاویتیمت بۆ بسەلمینم . سەرەتا ئەم هۆكارە لام روون نەبوو . و بەردەوام لەخۆمم دەپرسی چی منی بەم ئافرەتەوە بەستۆتەوە ؟ و هەمیشە دەموت بۆ هیندەم پیویست پییەتی ؟ و ئەو شەوە هۆكارەكەم زانی ، لە یادتە ؟ ئەو شەوەی دوای دۆرِاندنیكی سەخت لەبەردەم بەرامبەرەكەم لە هەڵبژاردنەكاندا و شەرِە جوینیكی زۆر لەگەڵ هاوسەرەكەم كاتیك لە ئامیزی هاوڕێیەكمدا بە رووتی گرتم . هاتم بۆلات و لە باوەشتدا گریام و كاتیك دەگریام هەستم دەكرد ئەو فرمیسكانە وەك هەڵمیكی پەستینراو لە ناخمدا قەتیسماوە ، لەو كاتەوەی باوكم لیم نیگەران بوو و وتی : پیاو هەرگیز ناڵیت ( ئای ) . ئەو شەوە فرمیسكەكانم وەك رووبار بوون ، و گویم لە دەنگی خۆم بوو كە دەیان جار دەموت : ( ئای ) ، و كاتیكیش بەئاگا هاتم بینیم سەرم لای قاچەكانتەوەیە وەك چۆن مرۆظیك چۆك دادەدات لە پەرستگا لە بەردەم خوداوەندەكەی . چی دەڵییت ئازیزەكەم ؟ یەكەمین خەندەی راستەقینەت لەسەر دەموچاوم بەدیكرد ؟ پیموتی

کە ئەمە خۆشترین شەوە لە ژیانمدا ؟ ئەمە راستیە . بۆ یەکەمینجار لە ژیانمدا ئەوەم بۆ ئاشکرابوو کە چەند گەمژە بووم . کاتیك منداڵ بووم خەریك بوو یەکیك لە چاوەکانم لەدەست بدەم لە شەرِیکی منداڵیدا تا بیسەلمینم کە پیاوم . و کاتیك گەنج بووم بەردەوام ئامادەبووم بۆ زۆرانبازی . ئیستاش کە لە تەمەندام خەریك بوو مێشکم لە دەست بدەم لەبەردەم بەرامبەرەکەم ، پاشان ناپاکی هاوسەرەکەم . هەموو شتەکان لەو شەوەدا گۆرِان ، و رۆپۆشە دەستکردەکەی بە پیاویتی ناوی دەرکردبوو کەوتە خوارەوە ، و وام لیهات خۆمم بەراستەقینە بۆ دەرکەوت ، بۆ یەکەمجارە تیبگەم لەوەی کە پیویست ناکات چ بۆ خۆم و چ بۆ بەرامبەرەکەم ئەوە بسەلمینم کە پیاوم . واتای وشەی پیاو چیە ؟ و ئەو دۆزینەوەیە خۆشترین ساتە وەختەکانی ژیانم بوو ، و لوتم بە بنە پیکانت دەسرِی و شیوازی خوارەوەم لەژیر پیکانتدا ئازاری دەدام . چی دەڵییت ؟ دان بە خۆشەویستیم دەنیم بۆت لەو شەوەدا . بەڵی ئازیزەکەم پیموتی خۆشم دەویی . بەڵام ئەوەش بزانە هەر کە لە ماڵەکەت هاتمە دەرەوە و گەرِامەوە ماڵ و نوسینگەکەم شەرمم لەخۆم دەکرد . شەرمم لەوە دەکرد کە هەندیت لە بەشە شاراوەکانی خۆمم بۆ دەرخستی . بەشە مینەییەکەی . ئەو بەشەی هەموو پیاویك وەك کۆئەندامی سیکسی دەیشاریتەوە لە چاوەکان . و لە شەرمان برِیاری ئەوەمدا کە چیتر نەتبینمەوە . بەڵام شەوی دواتر گەرِامەوە لات ، شەوی دوای ئەو شەوەش ، و هەموو شەوەکانی تریش بی پچرِاندن . دەزانم بۆلات راپیچکراوم ، هاوکات راپیچکراوم بۆ ئەو جیهانە ساختەیەی بە جیهانی نیرینەیی ناودەبریت ، روپۆشەکە دەپۆشم و لە ریزبەندیەکەدا جیگەی خۆم دەکەمەوە ، و رۆڵی خۆم دەبینم . گورزی خۆم دەوەشینم کاتیك کەسێک نابیت لیم بوەشینیت ، و لەوەی بەسەر سەرمەوە وەستاوە گورزم بەردەکەویت بی ئەوەی وەلاَمم هەبیت بۆی . و ئەم قینەم

خەفە دەکەم و هەڵدەگرم تا دەگەڕێمەوە بۆلای هاوسەرەکەم . و فرمیسکەکانم هەڵدەگرم تا دیمە لای تۆ . من دوو بەشی یەکسانم ئازیزەکەم ، پیاو لە ئیمە لانی کەم پیویستی بە دوو ئافرەت هەیە . ئافرەتیك تا بتوانیت لە بەرامبەریدا توڕەبیت و قینی بەسەردا هەڵڕیژیت و ئافرەتیکیش تا لە ئامیزیدا بگری و فرمیسکەکانی ببارینیت . چی دەڵییت ئازیزەکەم ؟ بەڵی هاوسەرەکەم خۆشی دەویم ، لەگەڵ ئەوەشدا ناپاکیم لەگەڵ دەکات . من بڕوام بەم راستیە نەدەکرد ، بەڵام بڕوام پی هینا ، و خوم گرت بە هاوسەرەکەمەوە و زیاتر و زیاتر حەزم بۆی دەچوو ، بەڵی ، زیاتر حەزم بۆی هەبوو ئازیزەکەم ، لەبەر ئەوەی لەریگەیەوە شتێکی نویم بۆ ئاشکرابوو ، ئەوەم بۆ ئاشکرابوو کە من تەنها پیاو نیم لەسەر زەوی . دان بەوەدا دەنیم کە زۆر هەستم بە حەوانەوە کرد بە دۆزینەوەی ئەو راستیە . حەوانەوەی خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەو راستیانەی نەمدەتوانی خۆمی بۆ بەدەستەوە بدەم . حەوانەوەیەك کە گەر هەر پیاویك تامی بکات پاڵ بە هاوسەرەکەیەوە دەنیت بۆ ئەوەی ناپاکی بەرامبەر ئەنجام بدات . چەندم لە ساڵاَن لەدەستدا ئازیزەکەم لە نادیاری ئەو حەوانەوەیە .

چی دەڵییت ؟ من زۆر دواکەوتم . بەڵی بەڵی ، بەڵام شانسم لە زۆریك باشتر بوو . پیاو هەیە دەمریت و وا هەست دەکات تاکە پیاوە لەسەر زەوی .

چی دەڵییت ؟ ئافرەت هەر لە سەرەتاوە ئەم راستیە دەزانیت . بەڵی ئازیزەکەم . ئافرەت لە پیاو ژیرترە . ئەو هەمیشە دەزانیت کە تاکە ئافرەت نیە لەسەر زەوی . پیکیکی ترم بۆ پڕکە ، لەگەڵ سەهۆڵیکی زۆر ، و پیم مەبڕە و لیمگەڕێ با لە ئامیزتدا بمرم .

# نـامەیەکی تـایبەت بۆ هاوڕێیەکی هونـەرمەنـد

لەبەرئەوەی دڵـی خۆتـت بـۆ کـردمەوە و ئەو هەمـوو گلەیـیەت لیکــردم ، کە هیمنـــی و ناســکیەکەی گریانــدمی وەك لە تونــدی و رەقیەکەی ، گلەیی هونەرمەندیکی ئافرەت بۆ هونەرمەندیکی پیاو ، و هاوڕێیەك لە هاوڕێیەکی خۆشەویست ، کە هەستی خۆشەویستی لە نیوانیان هەستیکی قوڵی نەگۆڕِە بە خود ، ناسك و بی خەوش وەك هەوا و پـاك ، هینـدەی لە ناخـدا هەسـتی پـی دەکەیـن گەورەیە ئەوەندە بیدەسەلاَتین لە گرتنی لە ساتوەختیکی راستیدا . و لەوانەیە ئەوەبیت تایبەتمەندی هەستی نزیکی و تیکەڵـی گەرم و گورِ ، ئەو هیندە راستە خەریکە لامان دەبیتە خەون .

لەبەر ئەوەی تۆ ئەمەت بەسەر هینام ئەوا ریگەم بدە گلەیت لی بکەم ، کە من پیشتر گلەیم لەکەس نەکردووە . تەنانەت گلەیم لە دایك و باوکیشم نەکـردووە کە بـی ویستی مـن هیناومیـانەتە ئەم دونیـایە ، گلەیش لە خـوا نـاکەم کە بـی ویستی خـۆم دەمبـاتەوە . مـن گلەیـی لەکەس ناکەم ، نە لە پیاو و نە لە ئافرەت و نە لە خوایەك ، و گلەیم نـیە نە لە خۆشەویستیدا و نە لە رق لیبـونەوەدا ، ئـای کە چەنـدین برینداریم لە خۆشەویستیدا چەشتووە تا قین لیبونەوە .

بەڵام تـۆ بـویتە یەکیك لەو کەمینە خەڵکەی لە ژیانمـدان ، ئەوانەی کاتیك قەڵەم دەگرم بۆ ئەوە نانوسم تـا خەڵکـی بیخـویننەوە ، بەڵکو بە تـایبەت بۆ تەنـها کەسێک دەنوسم بە تـایبەتی ، ئەو بەدەر لە هەموو خەڵکی بیخوینیتەوە وەك ئەوەی کە خەڵکی نەبیت .

شتێکی زۆر تایبەت و دەگمەن کە زۆرجار ناتوانم بۆ خودی خۆمی بنوسـم، وەك برینیکـی قـوڵ لە جەسـتەدا ، وەك بیریکـی قـوڵ مـن لە بنەوەیـدا بـم ، تەنـانەت درِکە پەتکـیش هەسـت بە ئـازار دەکەم لە ئیسکەکانی سـەرمدا . ئایـا ئەوە قەدەرمە کە شتێکی جیـاواز بـم جـگە لەوەی هەم ، کە مینە نەبـم ( بە واتـای جیهـان بـۆ مینـە ) و پزیشـك

نەبم ( بەپێی دەرچوونم لە کۆلیجی پزیشکی ) . ئایا قەدەرمە کە مرۆظ بم پێش ئەوەی مێینە بم ، و هونەرمەند بم پێش ئەوەی پزیشك بم ؟.
لەو ساتەوەی لە دایك بووم هەست دەکەم ململانیم وەك ململانی وایە لەگەڵ قەدەردا . بەڵام من بەجۆریکی تر هەست دەکەم کە قەدەر لەگەڵمایە ، و هەر قەدەریش ویستویەتی کە هونەرمەند بم و مرۆظیش بم . ئیتر ئەو هیزەی تر کامەیە کە ویستویەتی مێینە و پزیشك بم ، ئایا قەدەریکی تری جیاواز هەیە لەوەی دەیزانین ؟
ساڵانی ژیان بە راپیچکراوی لەنیوان دوو قەدەردا مایەوە ، وەك پارچە گۆشتێک لە نیوان دوو دەمی ژەهراویدا . دەمەویت دەربازبم و هەڵبیم ، هەندیك جار هەست دەکەم هەڵهاتووم ، رزگاربووم ، و بە قوڵی هەناسەکانم هەڵدەمژم و قەڵەمەکە دەگرم بە دەستمەوە تا خۆم لەسەر رووی کاغەزەکە بدۆزمەوە بە راستگۆیی و بی خەوش ، ساکار وەك خەندەیەیەکی خۆنەویستانەی روخساری منداڵیك . و هەر وەك ساکاری منداڵیك وا هەست دەکەم کە هیچ شتێکی ئەوتۆم ئەنجام نەداوە شایەنی باسکردن بیت ، تەنانەت وشەکانی سەر لاپەڕەکەش هەست دەکەم کەمن و لەخۆم لاوازترن . بەڵام جیهان لەدەورم لەترسان تۆقیون ، وەك ئەوەی راستگۆیی وشە نبیت و درندەیەکی ترسناك بیت ، و راستیەکانیش وەك مردن و زیاتریشیان لیهاتووە .
ئایا لە مردن زیاتر هەیە لە ژیانماندا ، یان خودی ژیانمانە هەندیك جار لە مردن زیاترە ، من ئەم پرسیارەم لەخۆم دەکرد و وەڵامەکەیم نەدەزانی نە لە ژیانمدا و نە لە مردنمدا ، و نەمدەزانی جیاوازی بکەم لە نیوان مردنم و ژیانم ، هەندیك جار ژیانم وەك مردن دەهاتە پیش چاو ، و لەناکاو مردنیش وەك تاکە هیوایەك دەهاتە پیش چاوم بۆ ژیان .

ئازاریکی قوڵ دەگەیشتە ناخ لە گەیشتنی ئازاری چەقۆیەك قوڵتر ، بەملاولای خۆمدا دەگەڕام وەك ئەوەی بەدوای خەڵکانیکی تردا بگەڕێیم چەقۆیان هەڵگرتبیت لە جەستەیاندا ، وەك ئەوەی بەدوای کەسێکی تردا بگەڕێیم پیم بڵێت : بەڵی تۆ راستیت و جیهان هەڵەیە ، تۆ راستیەکان دەڵییت و جیهان درۆ دەکات .

ئەو کەسانە زۆر کەمن ، دەگمەنن وەك وشەی راستگۆیی ون دەبیت لە نیوان ئاسمان و زەویدا وەك دڵۆپیك ئاو ون دەبیت لە دەریایەکدا ، وەك لیدانیکی راستەقینەی دڵ کە لە سینەدا ون دەبیت و نادۆززریتەوە بۆمان گەر بمانەویت . ئایا چەند جار دڵ لیدانی راستەقینەی دەبیت لە نیو ملیۆنان لیدان و ترپەی تردا ، لە هەر خولەکیکدا دڵ حەفتا جار لیدەدات ( لە نیوەنددا ) و لە یەك کاتژمیردا چوار هەزار جار ، و لە مانگیکدا سی ملیۆن ، ئایا دەبیت دڵمان چەند لیبدات لە سالانی تەمەنمان ، و ئایا کەسێک هەیە لە ئیمە بتوانیت لیدان و ترپە راستەقینەکانی لە نیو بلیۆنان لیدان و ترپەدا جیابکاتەوە ، ئایا تەنانەت گەر بشزانیت ئایا دەتوانیت هەموویان بگریت گەر بیەویت ؟.

من لە ریگەیەکی تری مێشکمەوە دەمزانی و فیریان کردبووم کە قەبارەی ژیانم بریتی نیە لە ژمارەی ئەو سالانەی نیوان میژووی لەدایبوونم و مردنم ، من دەمزانی کە لیدانیکی جیاواز هەیە لە لیدانەکانی تر و لەوانەیە قەبارەی ژیانم تەنها بریتی بیت لە یەك ترپەی راستەقینە و لەوانەیە سەرکەوتن بەدەست بهینم لە گرتنی لە نیوان ملیۆنان لیدان و ترپەی ناراستی تردا ، یان بتوانم وشەیەکی ویستراوی راستەقینەی سەر کاغەزەکەم بیگرم لە نیو ملیۆنان وشەی تری خۆ نەویستانە .

بێ گومان من ئەم راستیەم دەزانی ، دەمزانی بە مێشکم و بە جەستەم ، دەیزانم بە هەردوکیان و بە هەموو ئەو هەستانەم کە هەمن و نیمن ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار ئەو بیگومانیە دەبووە

گومانیکی گەورە ، و ئەو دەبووە راستی و بەدەر لەو دەبووە گومان . لەو ساتانەدا من هەست دەکەم کوژراوم بە مێشک و جەستە ، و من هەڵەم و جیهان راستە . لەوانەیە خۆم ببینم کاتیك لە شەقامدام یان لە ئوتومبیلەکەمدا بە سەرسوڕماوی ، بەڵام بە راستی من هەست دەکەم کوژراوم ، و ئەو جەستەیەی کە ئیستا وا دەجوڵیت جەستەی راستەقینەم نیە ، و بکوژەکان جەستەمیان لە قولاَیی زەویدا شاردۆتەوە . و جەستەی ناراستەقینەم دەبینم لەبەردەممدا دەجوڵیت ، و لەوانەیە تەوقە لەگەڵ خەڵکی بکات . لەوانەشە پیبکەنیت ، لەوانەشە بە جیهان بڵیت کە من هەڵە بووم و ئەو راستە .

چۆن جەستەی کوژراوم لە ناخی زەویدا راکیشم ؟ چۆن دەستە نیمچە لەکارکەوتوەکەم دەجولاَند و قەڵەمم پیدەگرت ؟ نەمدەزانی . بەڵام بریتی بوو لە ساتوەختیك کە تیایدا یا دانیشتووم یا وەستاوم یان راکشاوم ، لەوانەیە هەر خۆم بە تەنها بم یان لە نیوان خەڵکی تردابم بەڵام من جەستەم دەبینی رادەپەڕی و بی ویستی من هەڵدەسایە سەرپی ، یان دادەنیشت گەر بە پیوە بوایە ، و دەتبینی رامدەکردوو لەو خەڵکە دوور دەکەوتمەوە گەر لەگەڵیان بومایە ، یان رامدەکرد بۆلایان گەر دوور و تەنیا بومایە .

وەك راپەڕینی ترس ، وەك کەسێک رووبەروو مردنی بینیبیت . و لە سەرسوڕمانی زۆرم بۆم ئاشکرا دەبوو کە بە راستی جەستەم هەڵدەلەرزیت، و دەنگم دەگیریت بەڵام ئەوە تەنها بریتیە لە ساتیکی هیندەی چاوتروکاندنیك ، وەك هاواریك ، دەیکەم بەسەر کەسێکدا لە کاتی قسەکردندا تا بیدەنگ بیت یان بەسەر کەسێکی بیدەنگ تا قسە بکات .

لەو ساتەدا قسەکەر بەرپرسیکی سەروخۆم بوو لە بواری ئیشی پزیشکیم . و یەکیك بوو لەو پیاوانەی جیهانیان لی پڕە . پزیشکیك کە سەرکەوتنی پزیشکانەی بە پیوانەی رووی زەوی دەپیویت .

پیاویـك وەك نیـرینەی جیهـان تەنهـا میینەیـی لە بـارەی ئـافرەتەوە دەزانیـت . و ویسـتی وەك چـۆن جیهـان مـامەڵەم دەكـات وا بكـات لەگەڵ بكـات نەمهیشت . رەتكـردنەوە لای مـن ئاسـایی بـوو ، لەبەر ئەوەی مـن مـرۆظم و مییـنە نـیم ، هونەرمەنـدم نەك پزیشـك . رەتكردنەوە ئاسانبوو لام وەك چۆن هەوا هەڵدەمژم ، بەڵام لای ئەو رەتكردنەوە قورس بوو وەك مردن .
هەمیشە سەرم لەوە سورِدەما كە بۆچی پیاوام لە جیهاندا بەرگەی رتكـردنەوە نـاگرن بەتـایبەت گەر لە ئـافرەتەوە بیـت . دەیـانبینم سورایی لە دەموچاویاندا نامینیت وەك لاشەیەكی مردوویان لیدیت .
ئایـا ئەو رەتكـردنەوەیە رووی راسـتیەكانی ئاشـكرا دەكـات و بۆیەكەمجـار دەزانیـت كە ئەوە روخسـاری مـردوویەكە ، یـان رەتكـراوەتەوە لە نـاخی خۆیـدا بـۆیە توانـای بەرگەگرتنـی دوو رەتكردنەوەی نیە لە یەككاتدا ؟
بە دەنگیكی وەك دەنگی سەرۆكەكان پیی وتم كە هیچ فەرمانبەریك ناكۆك نەبووە لەگەڵی ، و پیشتر هیچ ئافرەتیك لە قسەی دەرنەچووە . و چەكـمەجەی كتیبخـانە كەشـخەكەی بـۆ كـردمەوە و چەنـدین بـرِوانـامە و نیشـانی پـاڵەوانیتی و سـەركەوتنەكانی پیشـاندام ، و دیـواری ژوورەكەی هەمـوو چوارچیـوەی لە ئـاڵتون گیـراوی برِوانامەكـانی نـاوەوەی میسر و دەرەوە بـوون . روخسـاری سور بـوو بـوەوە و سپیتیەكەی نەمـابوو ، و سـەری بەرزكردبـوەوە ملیكـی باریـك بۆینبـاغیكی ئەستوری تیـوە ئـالاَندبوو (لەسـەر شـیوازی ئەمریكـایی نـوی ) و هەوایەكـی زۆری كردبـووە سنگیەوە و پشـتی راسـتكردبوەوە ، وەك ئەوەی بەزۆر بیەویـت پشـتی راسـتكاتەوە بیەویـت سـەركەوتنەكانی دەرەوەی دەربخـات لە كاتیكـدا لە نـاوەوە روخاوە بێئەوەی كەس بزانیت .
لەوانەیە ئەو وا هەسـتی كردبیـت كە تەنهـا مـن هەسـتم بەو دۆرِانـدنەی كردبیـت یـان بینیبیـتم ، و لەبەرئەوەی ئـافرەتم ئەوا

دۆڕاندنەکەی بووبوە دوو هێندە ، و ئارامی و لەخۆرازیبوون لای بووە تووڕەیی و نیگەرانی ، قیزەونی و حەزی بۆ بەرزکردنەوەم بۆ ئاسمانی حەوتەم بووە زیندەبەچاڵکردنم لە ناخی زەویدا و مۆرکردنی چاڵەکەش .

یەکەم جارم نەبوو دۆڕاندنی پیاوێك ببینم ، چونکە پیاوان زۆرن ، و ژمارەی دۆڕاندنەکان لە ژمارەی پیاوان زیاترە ، لە کۆتاییدا من تەنها ئافرەتێکم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئافرەت بووم دەمزانی کە لە نێو ئەو هەموو پیاوەدا لانی کەم پیاوێك هەیە نەدۆڕاوە ، و لە هەموو جوڵە و ئەملاولاکردن و ئاوڕدانەوەیەك بە ویستی خۆم یان بە پێچەوانەوە، بە جەستە و مێشکم ، بە هەردووکیان ، هەستم دەکرد کە بەدوای ئەو پیاوەدا دەگەڕێم ، و دەشمزانی کە یەکێك نییە ، و لەوانەیە دووان یا سیان یان چوار بن ، لەوانەیە ژمارەیان لە ژمارەی پەنجەکان تێپەڕ نەکات ، لەگەڵ ئەوەشی کە دەگمەنن کەواتە هەن و لەبەرئەوەی بونیان هەیە ئەوا دەبێت بیاندۆزمەوە .

جاریکیان کاتێك بەپەلە دەڕۆیشتم بینیمیت ، من لەو سەرۆکە نیگەران بووم . کاتێکیش نیگەران دەبم بەخێرایی هەنگاو دەنێم . تووڕەیی و نیگەرانی ئەوەم بۆ دەردەخات کە بەخێرایی بەرەو جەنگێکی نوێ دەچم ، و پێویستە کاتەکەم لە ڕیگەدا بەفیڕۆ نەدەم ، لەبەرئەوەی چرکە لە ژیانمدا بەهای هەیە ، و هەستکردنم بە جوڵەی زەمەن لام توندە تا ڕادەی ئەوەی بەخێرایی بڕۆم ، دەترسم مردن ڕیگەم پێ بگریت پێش ئەنجامدانی جەنگەکەم ، وەك ئەوەی ئەوە دوا جەنگم بێت لە ژیانمدا و دوای ئەوە بمرم ، و لەبەرئەوەی لە ڕاستیشدا من مردووم ئەوا لە مردن ناترسم ، و لەبەر ئەوەشی لە مردن ناترسم خەڵکی لێم دەترسن ، ئەوەشە هۆکاری ئەوەی کە لە هەموو جەنگێکدا دەمێنمەوە لەسەر زەوی .

ئەو ڕۆژە سەبارەت بە تووڕەی بوون و نیگەرانیم پرسیارت لێکردم و بۆم باسکردیت . من پێشتر بۆ کەسم نەدەگێڕایەوە .

نەمدەزانی چی بڵێم ، گەر بشمزانیایە نەمدەتوانی ، و هیچ کەسێک نە گویی لیدەگرتم و نە بڕواشی پیدەکردم چیم بوتایە ، ئایا بڵێم تەواوی جیهان هەڵەیە و من ڕاستم ئایا بڵێم جیهان هەمووی شیتەو من تەواوم ، ئایا بڵێم لەوەتەی لەدایك بووم هەست بە پیتەکان دەکەم وەك خوین بە جەستەمدا دین و دەچن ، و کاتیك قەڵەم دەگرم تەواوی جیهان فەنا دەبیت و چیژی خواردن و خۆشەویستی و سیکس و مردن نامینیت ، و لە دیڕەکەدا بتویمەوە وەك چۆن لە مردن و خۆشەویستیدا دەتویمەوە ، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەمزانی لە هیچ شتێکدا ناتویمەوە . ئایا بڵێم کە هونەر لە ویستەکانی خۆم بووە و بەڵام بە ڕێکەوت میینە دەرچووم ، و لە منداڵیمەوە میینەییم ڕەتدەکەمەوە لەبەر ئەوەی من نیم ، و لە دروستکراوی من نیە و بەڵکو لە دروستکراوی جیهانیکی پڕ نیرینەیە و بەتاڵە لە پیاوان ؟ ئایا بڵێم کە من ژیانم بە کەمیك لە ژیری و خۆشەویستیەکی زۆر بەڕیوە دەبەم و من بە شان و باڵی ژیریدا هەڵنادەم ویڕای بڕوانامەی پزیشکایەتیم و ئەوەی مێشکمان دروست دەکات جیهانی دەوروبەرمانە ، و لەبەر ئەوەی جیهان ساختەیە ئەوا مێشکیشمان ساختەیە ، و لە شۆڕشماندا بەسەر جیهاندا پیویستە شۆڕش ئەنجام بدەین بەسەر مێشکماندا . ئایا هەموو ئەمانە بڵێم ، گەر وتیشم ئایا کەسێک بڕوام پیدەکات ؟

ئەو رۆژە تۆ پیتوتم بڕوات پیدەکەم ، و سەرمسوڕما تا رادەی بڕوا نەکردن ، تا رادەی بوون بە پەیکەر لەسەر کورسیەکەم کە دانیشتبووم لەبەردەمتدا ، دەمویست بمینمەوە بەڵام هەستام و چوومە دەرەوە . لە یادم نیە بۆ چوومە دەرەوە . لەوانەیە کەسێکی تر هاتبیتە ژوورەوە . لەوانەیە زەنگی دەرگا یا تەلەفۆن لییدابیت . گرنگ ئەوەیە من چوومە دەرەوە و لەو رۆژەوە بە دەگمەن و ڕێکەوت نەبیت یەکترمان نەبینیوەتەوە . هەندیکجار لە ریگەو بانەکان دەتبینم بەخێرایی دەڕۆیت منیش هەروەها . هەندیکجار

چـــاوم بەهەنـــدیك وشـــەت لەســـەر رووی لاپەرەکە دەبیـــنم و هەڵویسـتەیەك دەکەم ، یـان چـاوم بە دەموچـاوت دەکەویـت لەنیـو دەموچاوەکاندا و چاویك هەڵدەبرِم و لەوانەیە سلاَویکت لـی بکەم لە دوورەوە گەر بمبینیت ، گەر نەشتبینیمایە بەخێرایی دەرِۆیشتم . لەگەڵ خێرایی هەنگاوەکانیشم هەستم دەکرد کە شتێک لە رۆحت بۆ هتایی لەگەڵمدایە ، لەخۆمم دەپرسی تۆ بڵێی ئەویش هەست بکات کە شـتێکم لە رۆحـم داوەتـی بـۆ هەتـایی و لـی وەرنـاگرمەوە . . هەندیك جـار سـواری ئوتـومبیلەکەم دەبـووم بەو نیـازەی بیم بـۆلات بەڵام رادەوەسـتام و دەمـوت بـرِۆم چـی پـی بڵـیم ، ئایـا ئەوەی لە نیوانمانـدا رویـدابوو بیـری مـاوە ، ئایـا شـتێکی وا رویـداوە تـا بیـری مابیت ؟

نەمـدەزانی کە ئایـا شـتێک رویـداوە ، گەر روشـی دابیـت چیە ، ئایـا شــتێکە بیــرەوەری دەتوانیــت وەك بەڵــگەیەك هەڵیگرتبیــت ، وەك شـتێک بـیکەمە بیـانوو گەر بمەویـت بچـمە لای ، وەك هۆکاریـك بمەویت بیکەمە چەند وشەیەك گەر لیی پرسیم بۆچی هاتووی .

چەند ساڵ تیپەرِیوە نەهاتووم بۆلات ، نـازانم ، چونکە من زەمەن بە سـاڵ نـابژیرم ، و تەمەنـم هەمـووی لە پـیش چـاوم ناکـاتە تەنهـا سـاتیك کە بە مێشـک و جەسـتە و هەمـوو توانـام هەسـت بە زانـایی بکەم ، من هەمیش هەستم بەوە دەکرد کە سـەرجەم هەستەکانم لانیە ، و لەسـەر روکـاری جەسـتەم ترپەیەکـی تـری جـگە لە تـرپەی دڵـم هەیە ، و مێشکیکی تر لە ژیر مێشکمەوە ، و جەستەیەکی تـر لەژیـر جەستەمەوە . ئایا ئافرەتیکی تری تەواو هەیە لە نـاخی منـدا ، کامیـان منم ، کامیان راستیەو کامیان پیچەوانەکەیەتی . من بەردەوام هەستم دەکـرد کە لە نیـوان راسـتی و ناراسـتیدا مـاوەیەکی هینـدەی قەبـارەی تاڵە موویەك هەیە ، و هەمیشە هەوڵـی پسـاندنیم داوە تـا ئەو نادیـاریە بشیوینم ، و هەردوکیشیان ، دیـار و نادیـار ، هەسـتی پـی دەکەم وەك حەزیـك لە جەسـتەمدا ، و زانسـتی پزیشـکی و تویکـاری ترسـی

جەستەی لە چاوەکانمدا شکاندبووە ، و هونەر ترسی نادیاری ڕەواندۆتەوە ، و دەمەویت لەبارەی جەستەوە سەرجەم ئەندامەکانیەوە بدویم وەك چۆن شاعیرەکان لە بارەی ترپەی دڵەوە دەدوین ، و هەمیشە دەپرسم بۆچی ترپەی دڵ تەنها ترپەی ریگە پیدراوە؟

چەند ساڵ تیپەڕِیوە بێئەوەی بیمەلات . بیرم نیە ، بەڵام بیرمە کە لە ساتیکی کتوپڕدا ، لەو شۆڕِشەی تیایدا تاڵە مووی نیوان دیار و نادیار دەپسینم و دەزانم کە جیهان هەڵەیە و من ڕاستم ، و حەز بە مردن دەکەم ، یان بە ژیان ، و لەو ساتوەختەدا پەنجەم کرد بە بازنەی ژمارەی تەلەفۆنەکەدا و ژمارەکەتم لیدا و پیاویك وەلاَمی دامەوە پیی وتم کە لە ماڵەوە نیت و ناو و ژمارەکەمم جیهیشت و پیموت کە چاوەڕِوانی وەلاَمم.

چەند ساڵ تیپەڕِیوە و من هەر چاوەڕِیم ، نازانم ، و هەوڵم نەداوە بیرم بیتەوە ، چونکە نیگەران بووم و نیگەرانی بیرەوەریەکانمی لەناو بردووە و هیچم بیر نەماوە . و هەرکاتیکیش بیرم بهاتایەتەوە زۆر بیتاقەت دەبووم و بیرم دەچوەوە تا وامليهاتووە نیگەران نابم و بیرم ناچیتەوە ، و خەریکە لەهەر ساتیکدا بیرم دیتەوە ن و لەهەمان کاتدا نازانم چیم بیر بیتەوە ، چونکە هیچ شتێکی وا لە نیوانماندا روینەداوە تا بیرم بیتەوە ، و هیچ بەڵگە و هۆکاریك نیە تا هەر کەسێکلیی پرسیم پیی بڵیم .

جاریکیانلە دوورەوە بینیمیت وەستام و هاتم بۆلات ، بەڵام لامکردەوە و ئاراستەم گۆڕِی و بەخێرایی هەنگاوەکانم دەنا و لەخۆمم دەپرسی ئایا ئەوە خۆشەویستیە ، ئایا شتەکان تا ئەم رادەیە تیکەڵ دەبن ؟ تا رادەی نەتوانینی جیاکردنەوەی خۆشەویستی و نا خۆشەویستی ، تا رادەی نەتوانینی بینینی رەش و سپی ، تەواو وەك نابینا ، کەمیك وەستام تا بیمەوە سەرخۆ و لەخۆمم پرسی ئایا جیهان

تواناى بینینی لە چاوەکانم بردووە ئایا دەشیت جیهان عەسەبەکانی چاو و دڵی لەناوبردبیت ؟
من دەمزانی کە جیهان هەموو شتەکانی لەناوبردووە من نەبیت ، و مرۆظی لەناوبردووە بۆ کۆیلە و سەردار ، و مرۆظی لەناوبردووە بۆ مێشک و جەستە ن و جەستەشی لەناوبردوە بۆ ئەندامە شەریف و ناشەریفەکان، من دەمزانی کە جیهان هەموو شتەکانی لە جیهاندا لەناوبردووە تەنها من نەبیت ، پیاوان و ئافرەتان و مندالاَن و دەسەلاَتداران و تاوانبارانی لەناوبردووە ، و هیچ ماوەیەك نیە لەنیوان لەناوچوونی سیاسی و سیکسیدا ، و هونەرمەندی راستگۆ بەو راستگۆییەیەوە دەکەویتە عەیبە سیاسیەکانەوە ، و بەهونەرەکەی نوقمی هەردوو جۆرەکە دەبیت ، سیکس و سیاسەت ، نەگبەتی هونەر و نەگبەتی مرۆظ بەڵام هونەرمەند راپیچکراوە بۆ ریزبەندی تۆمەتبارەکان لەژیر هەر ناویکدا بیت و لەسەر هەر زەوییەك ، و نەفرەت لە مرۆظایەتی بوونی دەکات لە جەستەی دەسەلاَتداراندا و بەهەر کیشیك و هەر شێوەیەك بیت ، سەرنجی راکیشراوە بۆ سیکس لەژیر پەردەی خەیاڵی هەر خۆشەویستیەکدا بیت ، پەیوەست بووە بە جیهانەوە بە هەموو ئەوانەی تییدایە و لەسەریتی ، دەزانیت کە جیهان ، بی گومانە لەوەی کە لەناوی دەبات و بی گومانیشە لەوەی کە هەرگیز لەناو ناچیت .
چەند ساڵ تیپەڕِیوە نەهاتووم بۆلات ؟ بەڵام من جاریکیان بەڕێکەوت رۆژنامەکەم کردەوە ، چونکە من رۆژنامەکانی جیهانیك ناکەمەوە کە تیایاندا قەڵەمەکان و جەستەکان درۆ بکەن . ئەو بەیانیە نەمزانی بۆچی رۆژنامەکەم گرت بە دەستمەوە . لەوانەیە ویستبیتم لەناو یەکیك لە رەفەکانی ناو چیشتخانەکەدا رایبخەم ، بەڵام دەموچاوی تۆم بەدیکرد ، و وشە وردە رەشەکانتم خویندەوە ، لاپەڕِەکە جوڵەیەکی سەیری هەیە لە جوڵەی چاوەکانی تۆ دەکات کەسەیریان دەکردم . ئایا تۆ منت دەبینی کاتیك دەتنوسی ، بەڵام تۆ

سالاَنیکی زۆرە نەتبینیوم ، و هیچ مێشکیکیش نهیە چەند بەتوانا و پتەو بیت بتوانیت ئەو هەموو ماوەیە ئەو شتانە هەڵگریت ، چ جای شتێک کە روینەدابیت ؟
کاتیکیش زەنگی تەلەفۆنەکە لییدا وامزانی زەنگم لە هەموو جیگەیەکی سەر زەویەوە بۆدیت تەنها لە نوسینگەکەی تۆوە نەبیت .
کاتیکیش هاتم بۆلات وامزانی چەند وشەیەکی ئاسایی ئاڵوگۆڕ دەکەین ، وەك ئەو وتە و قسە ئاساییانەی نیوان خزمان و هاوڕێکان . بەڵام وشەکانت ئاسایی نەبوون ، و گلەییەکەت ئاسایی نەبوو . و زۆر سەرمسوڕما ، و ئازارم زۆربوو . پیموتی جاریکیان هەوڵمداوە بتبینم وەلاَمم پی نەگەیشتەوە . و بڕوات پی نەکردم و پیتوتم گەر بتویستایە بهاتیتایە دەهاتیت . بۆم سەلماندی کە جاریك هەوڵمداوە بەڵام بڕوات پی نەکردم و پیتوتم گەر بتویستایە چاومان بە یەکتر بکەویت نەتدەهیشت هیچ شتێک بینینی یەکترمان لی بکات .
تۆ زۆر دڵ رەق بویت لە بڕوا نەکردنت پیم .. و هیندەی ئەو رەقیەت ئازاریدام هیندە سەرمسوڕما . و خۆزگە ئەو سەرسوڕمانەت لە چاوەکانمدا دەبینی کە لە شێوەی فرمیسکدا بوو ، من تا رادەی گریان سەرمسوڕمابوو، ئایا دەشیت مێشک دوای ئەو هەموو سالاَنە تیپەڕیوە تواناییتی شتێک هەڵگریت و بپاریزیت کە روینەداوە ، و گەر روشی دابیت تەنها چاوتروکاندنیك بووە ، وەك بریسکەی تیشکیك دیت و نامینیت ، وەك ترپەی دڵ ترپەیەك بووە و دواتر لەناو ملیۆنان ترپەی تردا ون بووە .
کاتیکیش دەستت لە تەوقەکردنەکەدا لەناو دەستمدا بوو دەمزانی ماچم دەکەیت ، و ماچەکەت لەسەر دەموچاوم بەسۆز و هیمن دەبیت ، وەك ماچی منداڵیك بۆ منداڵیکی تر ، و پاك و بیگەرد ، وەك هەموو هەستیکی راستەوخۆ .

ژمارەی تەلەفۆنەکەتت لەسەر پارچەیەك كاغەزی بچوك دامی ، و بەڵێنم پیدایت كە پەیوەندیت پیوە بكەم . و راستگۆ بووم لەو بەڵێنەمدا ، بەڵام هەر هیندە كە چوومە سەر شەقامەكە هەموو شتەكانم وەك خەون هاتە پیشچاو ، یان خەیاڵ ، و هەستمكرد كە گلەیی شتێكی ئاساییە لەنیوان هەردوو كەسێک كە هاوڕێی یەكتر بن و ماوەیەكی زۆربیت یەكتریان نەبینیت ، هەروەها ماچیش ئاساییە لەنیوان هەردوو هاوڕێیەكدا روبدات.
و كاتیك بەخێرایی هەنگاوەكانم دەنا هەستم دەكرد كە بەردەوام دەبم لە رۆیشتن وەك جاران و دەمرم لەو كاتانەی داڵغە دەمباتەوە ، و ساڵانێكی زۆری تر تیدەپەڕن تا راستی و ناراستیم بۆ دەردەكەویت ، و من لە هەموو جاریكدا ناتوانم مردن بشیوینم و داگیری بكەم ، توانای پساندنی تاڵە مووی نیوان راستی و گومانم نیە . ئایا من راستم و جیهان هەڵەیە ، یاخود من هەڵەم و جیهان راستە ؟ گەر ئەمجارە بڕوام پی نەكەیت ئەوا گلەییت لی دەكەم ، گەر بڕواشم پی بكەیت ئەوا گلەییم لیت زیاتر دەبیت.

# دانیشتنێکی نهێنی

یەکەمین شتێک کە هەستم پیکرد ئەو تیشکە بەهیزە بوو . هیچت نەبینییوو . تیشکەکە بە ئازاربوو لەگەڵ ئەوەی هیشتا چاوەکانی لیکنابوو، هەوا ساردەکە لە دەموچاو و گەردنی روتی دابوو ، و لە بۆشایی گەردنیەوە ئەو هەوایە چوبووە ناو سنگ و سکیەوە ، و دابەزیبوە خوارەوە بۆ برینە تەرِ ەکەی ، وەك شەختەی لیهاتبوو . دەستەکانی خستبووە سەر چاوەکانی تا لە تیشکەکە بیپاریزیت ، و بە دەستەکەی تریشی ئەو بۆشاییەی گەردنی داخست لەوکاتەی قاچەکانی جوتکرد بەهۆی ئازاریکی کتوپڕ . هەروەها لێوەکانیشی جوتکردووە لەتاو ئەو ئازارەی پیشتر جەستەی بەخۆیەوە نەیبینیبوو ، وەك ئازاری وەشاندنی دەرزییەك بۆ چاوەکانی و مەمکەکانی و سنگی و سکی و بەرمیزڵدانی . پیکانی و قاچوکانی کە هیندە بەپیوە نوستبوو ، هیندەش بە پیوە نوستبوو نەیدەزانی شیوازی جەستەی چۆنە و لە چ باریکدایە ، ئاسۆییە یان ستونی ، بە قاچەکامی لە هەوادا هەڵواسراوە ، یان لەسەر سەر لە ئاودا وەستاوە .

هەر هیندەش کە دایاننیشاند بە ناو لەپی دەستی هەستیکی ئەو جییەی لیی دانیشتووە وەرگرت و شێوەی مرۆظانەی وەرگرتەوە . حەزیك و حەوانەوەیەك جەستەی داگرت کاتیك لەسەر ئەو کورسیە تەختەیە دانیشت ، و لەوانەیە ماسولکەکانی لێوەکانی لە خۆشیان چوبنەوە

یەك وەك خەندەیەك لەخۆی پرسی : ئیستا دەزانم کە دانیشتن چەند خۆش و ئارام بەخشە بە جەستە .
تیشکەکە هیشتا پتەوبوو ، و چاوەکانیشی هیشتا توانای بینینیان نیە ، بەڵام گویچکەکانی هەندیك قسە و چرپەچرپ دەبیستیت . دەستەکانی لەسەر چاوەکانی هەڵگرت و بەهیواشی پیلوەکانی هەڵدەبڕِی . سیبەرو تارمایی خەڵکانیك لە بەردەمیدا لەسەر شتێکی بەرز دین و دەچن . هەستی بە ترسیکی کتوپڕ کرد . لەبەرئەوەی سیبەرو تارمایی مرۆظ زیاد لە هەموو شتەکان دەیترسینیت . ئەو جەستە دریژانە کە بەخێرایی دەجوڵین لەناو پانتۆڵەکان و قاچەکان لە پیلاَوداَ . و هەموو شتێک لە تاریکیدا و بەهیمنی رودەدات . ئەویش ناتوانیت نە بگری و نە هاوار بکات . زمانی ، چاوەکانی ، دەمی ، لوتی ، سەرجەم روخساری بووە بە بەرد و جەستەی ، جەستەی ئەو نەماوە ، بەڵکو جەستەی بەرخیکی بچکۆلانەیە بە پیکانی لەزەوی دەدات ، و گۆچانیك دەخاتە نیوان رانەکانی تا ناو جەستەی بشیوینیت ، پاشان بە پی لەقەیەك دەچیتە سوچیکی تاریکەوە ، و بە چەماوەیی بە دەوری خۆیدا دەمینیتەوە تا رۆژی دوایی . بۆ رۆژی سیهەم وەك پیشوو نیە بەڵکو بەردەوام وەك ئاژەڵیکی بی دەسەلاَتە لە دەربڕِینی هەر وشە و دەنگیکی ئاسایی کە مرۆظ دەریدەکات : خوایە . و لەخۆی دەپرسیت : ئایا ئاژەڵەکانیش وەك مرۆظ شتێک دەناسن ناوی خوا بیت ؟
چاوەکانی دەستیکرد بە بینینی ئەو جەستانەی لەسەر ئەو بەرزاییە دانیشتوون . لەسەر هەر سەریك جەستەیەك هەیە . سەرەکان ساف و لوسن بی موو ، سورهەڵگەڕِاو وەك سمتەکانی مەیمون لە پشتەوە . بیگومان هەموویان نیرینەن ، لەبەرئەوەی ئافرەت هەرچیەکی لی بەسەر بیت سەری وەك کۆتایی مەیمونی لی نایەت . چاوەکانی گیرِا تا رونتر ببینیت . لە ناوەڕِاستدا پیاویکی قەڵەو وەستاوە شتێکی وەك پاڵتۆیەکی رەشی لەبەردایە ، دەمی کراوەتەوە

، و شـــتێکی بەدەســـتەوەیە وەك چەكــوش وایە ، جـــادوگەرەکەی گوندەکەیانی بیردیتەوە کە هەموو چاوەکان و چاوی منداڵەکانیشی لەسەر بوو تا ئەو گۆچانەی بە دەستیەوەیە بیکاتە مار یان ئاگر . چەکوشەکە بە دەستیەوە خواربوەوە وەك مار ، و دەنگیکی تیژ هاتە گویی دەیوت : دادگاییە ! لەخۆی پرسی : لەوانەیە ئەوە دادوەر بیت . ئەویش بۆ یەکەمجارە لەژیانیدا دادوەر ببینیت ، و بۆ یەکەمجارە بچیتە دادگا . وشەی دادگای تەنها یەکجار گوی لیبووە کاتیك منداڵ بووە . گویی لیبوو خاڵۆژنی بە دایکی دەوت : دادوەر برِ‌وای پی نەکردم داوای لیکردم جەستەمی بۆ رووت بکەم تا شوینەواری لیدانەکان ببینیت ، منیش پیموت جەستەم رووت ناکەمەوە لە پیشچاوی پیاویکی بیگانە ، داواکەی رەتکردەوە و داوای لیکردم بگەرِ‌یمەوە بۆلای میردەکەم . خاڵۆژنی دەگریاو نەیدەزانی بۆچی دادوەر داوای لیکردووە جەستەی رووت بکاتەوە . لەخۆی پرسی : ئایا دادوەر داوام لیدەکات جەستەم رووت بکەمەوە ، ئەی چی دەڵیت گەر ئەو برینە ببینیت ؟

چاوەکانی لەسەر تیشکەکە راهاتبوو ، و روخساری دادوەری بە جوانی و بی خەوش دەبینی . دەموچاویشی سوورە وەك سەری ، چاوەکانی بازنەیی و گیژ وەك چاوی بۆق ، هیمنانە ئەملاولا دەکەن ، لوتیشی گەورەو چەماوە وەك دەنوکی پەپو ، لەژیریدا سمیڵیکی زەرد وەك چەپکیك پوش و پەلاَ‌شی وشك هەلاَ‌توو لەسەر دەمی وەك وایەر دەلەرییەوە ، لە تەڵەی مشکی دەکرد .

نەیدەزانی بۆچی بەردەوام دەمی کرابوەوە ، ئایا بەردەوام قسەی دەکرد یان لەویوە هەناسەی دەدا ، و سەرە بی مووەکەی بەهیمنی بۆ دواوە دەجولاَ‌ند و دواتر کەمیك بۆ پیشەوە لەو شتەی کە لەبەریدا بوو نەیدەزانی پشتەوەی چیە بەڵام کە سەری دەبردە دواوە وەك ئەوە وابو سەر بکات بە پاژنەی پیلاَ‌ویکدا . جوانتر ورد بوەوە دڵنیا بوو کە وایە پیلاَ‌وە لەسەر سەرووی دادەوەرەوە لەسەر

دیوارەکە کیشراوە . لەسەروو پیلاَوەکەشەوە دوو پی لە پانتۆلاَ وەستاوە ، لەچەرمیکی گرانبەهای دەکرد وەك پیستەی پڵنگ یان مار . و چاکەتەکەش بەسەر شانەکانەوە گریدراوە، لەسەروو ئەو دوو شانەشەوە ئەو دەموچاوەی بینی کە هەزاران جار لە رۆژنامەکاندا بینیویەتی .

دوو چاوی بەرز لەبۆشاییەك گەمژەیی زیاتر وەك لە ژیری ، لوتیکی تەخت وەك ئەوەی بە چەکوش لیی درابیت تا پان بۆتەوە ، دەمیکی دروستکراوی جوتی دەستکرد کە سەرجەم دەسەلاَتدار و پادشاکان سەلیقەن لە دروستکردی کاتیك لەبەردەم کامیراکانی وینە گرتندا خۆیان دەبیننەوە . لەگەڵ ئەو لێو جوتکردن و خەندە دەستکردەی هیشتا رومەتەکانی شۆڕبونەوەیەکی گاڵتەجاریانەی پیوە دیارە کە گوزارشت لە پاتاڵی و گەندەڵی دەکات هەر لە منداڵییەوە .

ئەو منداڵ بوو لە سەرەتایی کە بۆ یەکەمینجار وینەی پادشای بینی . دەموچاوەکەی گۆشتن و چاوەکان پڕ و تەنگ و لێوەکان جووت و پۆزن و قیزەون . دەنگی باوکی بیرهاتەوە کە دەیوت : ئەو داوین پیس و سەرسەری بوو ، بەڵام ئەوان هەموو بەو شێوەیەن ، کاتیکیش لەبەردەم کامیرای وینە گرتنەکاندا دەوەستن خۆیان بە خوا دەزانن .

ئەو هەست بە جەستەی دەکات هیشتا دانیشتووە لەسەر کورسیە تەختەکە ، و دودڵە لە کەش و هەواکە . چۆنە لیی گەڕاون ئەو هەمووە دانیشیت . و دانیشتن بەم شێوەیەش حەوانەوەیەکی تەواوە باسناکریت . ئەو دەتوانیت خۆی شل بکات بۆ ئەو حەوانەوەی دانیشتنە و هەست بەو هیزە لەبن نەهاتووەی مرۆظ بکات کە لە جەستەیدا هەیە . بۆ یەکەمجارە جیاکارییەکی گەورە لەنیوان جەستەی مرۆظ و جەستەی ئاژەڵدا بکات کە دانیشتنە . هیچ ئاژەڵیك نیە بتوانیت ئاوا وەك ئەو دانیشیت .

گەر دانـش بنیشـیت چـۆن دەتوانیـت مـامەڵە بکـات بە هەر چـوار دەسـتەکەی؟ ئەو دیـمەنەی هـاتەوە یـاد کە لە منداڵیـدا زۆر پیـی پیکەنیـوە ، ئەویـش ئەو بەرخـۆلەیە بـوو کە ویسـتی لەسـەر قنـگ دانیشیت نەیتوانی و بە پشتاکەوت . ماسولکەکانی لێوەکانی و دەمی گـرژییەك گرتـی ویسـتی دەم بکـاتەوە و شـتێک بڵیـت یـا خەنـدەیەك بکـات ، بەڵام دەمـی بە داخـراوی مـایەوە وەك هیڵیـك بەشـی خوارەوەی دەموچاوی کردووە بە دوو بەشەوە. ئایا دەتوانیت کەمیك دەم بکـاتەوە تـا تفیـك بکـاتەوە ؟ بەڵام گەرووی و نـاو دەمـی و گەردنیشـی وشـکە هەمـوو شـتێک تیایـدا وشـکە تەنهـا ئەو بـرینە تەرِەی نیوان رانەکانی نەبیت .

قاچەکـانی کـۆکردەوە و ئـازارەکەی بیرخـۆی بـردەوە تـا چیـژ لەو دانیشـتنە وەرگریـت لەسـەر کورسـیەکە . ئەو دەیتـوانی بەو شـێوەیە بمینیـتەوە بـۆ هەتـایی یـان تـا مـردن . بەڵام لە ناکـاو گـویی لە نـاوی خۆی بوو بانگ دەکرا: لیلا الفرجانی !

هەستەوەرە مردووەکانی بەئاگا هاتنەوە ، و ماسولکەکانی گویچکەی راچەمین لە بیستنی ئەو نـاوە سـەیرە . لـیلا الفرجـانی ! وەك ئەوەی ئەو نـاوە نـاوی ئەو نەبیـت . مـاوەیەکی زۆرە گـویکەی هیچـی نەبیستووە . بەتایبەت بۆ کچیك بیت ناوی لیلایە ، کچیك جلوبەرگی کچانەی لەبەردایە و خۆر دەبینیت و لەسەر دوو پی دەرِوات وەك هەمـوو مرۆظیـك. و ئەم کـچە مـاوەیەکی زۆر لەمەوبەر بینـراوە ، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆرە جلوبەرگی کچانەی نەپۆشیوە و خۆری نەبینیوە و لەسـەر دوو قـاچیش نەرِۆیشـتووە . مـاوەیەکی زۆرە ئەو ئاژەڵیکی بچکۆلانەیە لە ناو ئەشکەوتیکی تەنگ و تاریکدا ، کـاتیکیش بانگیان دەکرد بەناوی ئاژەڵەکانەوە بانگیان دەکرد .

هیشتا چاوەکانی لە هەوڵی بینینی رونتر و باشتردا بـوون ، و سـەری دادوەر و جوڵەکـانی رونتـر و جـوانتر دەبینریـت ، بەڵام هەر کە بەرزبیـتەوە دەچیـتە پـاژنە پـیلاَوەکەوە ، و گەر نـزمیش بیـتەوە

دەچیتە ئەو بۆشاییەی لە گەردنیدایە . و وینەکەی سەر سەریشی رونتر دەردەکەویت . پیلاَوەکان تیژ و بە بریقەن ، و جلەکەی بەری توندکراوە وەك جلوبەرگی ئەسپ سوارەکان ، و دەموچاوەکە لەدەرەوە ماسولکەکانی دەستکرد دەردەکەون پڕی رەسەنایەتی و گەمژەییە ، لە ناویشەوە تیرِوانینیکی گاڵتەجارِیانەی سارد .
توانای بینینی وەك جاران نەماوە ، بەڵام ئەو هیشتا شیواندنەکان بە جوانی دەبینیت ، دەموچاوی مەسخ کراو دەبینیت ، و قیەکانی باوکی بیرهاتەوە : کچەکەم ئەوانە ناگەنە کورسیەکانی دەسەلاَت گەر لە رووی دەروونیەوە شیواو نەبن و لە ناویشەوە گەندەڵ .
چۆن گەندەڵیەکیش لە ناوەوە ! ئەو گەندەڵی راستەقینەی بینین . لەوکاتەدا خوازیاری ئەوە بوو کە قەڵەم و کاغەزیکی بدەنە دەست تا وینەی ئەو گەندەڵییە بکیشیت . بەڵام ئایا دەشیت پەنجەکانی وا مابنەوە تاکو توانای گرتنی قەڵەمی هەبیت جوڵەی پی بکات بەسەر کاغەزدا ؟ چی بکات گەر یەکیك لەو دوو پەنجەیەیان قرتانبیت کە قەڵەمی پی دەگریت ؟ ئایا دەتوانیت بە تەنها پەنجەیەك قەڵەم بگریت ؟ ئایا مرۆظ دەتوانیت بە تەنها قاچیك بەسەر زەویدا برِوات ؟
یەکیك لەو پرسیارانەی باوکی بەردەوام دەیوتەوە ، و قینی لەو پرسیارە بیدەسەلاَتانە بوو و بەخۆیی دەوت : کە پەنجەم دەقڵشینم و قەڵەمەکەی پیدا دەکەم . وەك چۆن ئیزیس قاچی ئوزوریسی وا لیکرد . ئەو هیشتا ئەو چیرۆکە کۆنەی بیرماوە ، و هیشتا دیمەنی ئەو قاچە قڵشاوەی لە پیشچاوە کە خوینی لەبەر دەرِۆیشت . بە واتا دیوەزمەیەکی لەمیژینە بوو دەیبینی ، چەندیش خوازیاری ئەوە بوو کە دەستی دایکی رایوەشینیت و لە خەو بەئاگای بینیتەوە .
کاتیك مندالْ بوو زۆر شادمان و بەختەوەر دەبوو کە چاوەکانی دەکردەوە و دڵنیا دەبوو لەوەی کە ئەو درِندەیەی دەیویست جەستەی هەڵوەشینیت تەنها خەون بووە یان دیوەزمەیەك بووە وەك دایکی ناوی دەبرد . هەموو جاریك کە چاوەکانی دەکردەوە شادمان

دەبوو بە نەمانی درِندەکە و بۆی دەردەکەوت کە ئەوە تەنها خەون بووە . بەڵام ئەو ئەمجارە چاوەکانی کردەوە کەچی درِندەکە نەرِۆیشت . چاوەکانی کردەوە بەڵام درِندەکە هەر لەسەر جەستەی بوو . لەترسان دوبارە چاوەکانی لیك نایەوە تا بنویتەوە ، تا وا بیت بە خەیاڵیدا کە دیوەزمەیە. بەڵام چاوەکانی کردەوە و بۆی دەرکەوت کە خەون نیە و هەموو شتێکی بیرهاتەوە .

یەکەمین شتێک کە بیری هاتەوە هاواری دایکی بوو لە تاریکی شەودا . ئەو هیشتا وەك منداڵیکی شەش ساڵاَن لە باوەشیدا دەنوست لەگەڵ ئەوەی گەورە بوەو لە بیست ساڵیدا بوو . بەڵام دایکی دەیوت : لە باوەشمدا دەنویت تەنانەت تا ئەو کاتەی دین و دەتبەن منیش تاوت دەدەمی تا منیشت لەگەڵ دەبەن .

هیچ شتێک هیندەی دەموچاوی دایکی ئازاری نەداوە کە لیی دەرِوانی کاتیك بردیان تا روخساری دیارنەما و ون بوو . دەموچاوی پەشۆکاو و رەنگی زەرد ، خوازیاربوو بمردایە و ئەو دیمەنەی روخسار و دەموچاوی دایکی بەوشێوەیە نەبینیایە . بەخۆی وت : دایە ئایا دەبیت بمبوری کە بومە مایەی ئەو هەموو ئازارە بۆت ؟ دایکیشی بەردەوام پیی دەوت : کچی خۆم تۆ چیت داوە لە سیاسەت ، تۆ پیاو نیت ، و کچان لە تەمەنی تۆدا تەنها بیر لە شوکردن دەکەنەوە . ئەو وەلاَمی دایکی نەدەدایەوە بۆ ئەو قسانەی : سیاسەت یاریەکی قیزەونە تەنها پیاوە بەتاڵەکان دەیکەن .

ئیستا دەنگەکان لە گویچکەیدا باشترە ، و هەروەها وینەکانیش رونترن ، هەرچەند هیشتا تارماییەکە زۆربوو . ئایا وەرزی زستان بوو و هۆڵەکەش بی سەقف ، یاخود وەرزی هاوینە و ئەوان جگەرە دەکیشن لە ژووریکدا پەنجەرەی تیدا نیە ؟ توانی پیاویکی تر ببینیت لە دووری دادوەرەوە دانیشتووە ، سەری وەك سەری دادوەر وایە لوس و سوور بەڵام لە پیلاَوەکەدا نیە وەك سەری دادوەر . ئەو لەولاوە دانیشتووە ، لە پشت سەریەوە شتێکی تر هەڵواسراوە وەك

ئالاَیەکی تیدابیت وایە ، یان ئالاَیەکی چەند رەنگی بچوك . بۆ یەکەمجارە گویچکەی چەند رستەیەکی بە واتا ببیستیت .
( بیهیننە پیشچاوی خۆتان بەڕێزان ئامادەبووان کە ئەم قوتابیەی نەگەیشتۆتە تەمەنی بیست ساڵی " خوا بیپاریزیت و بۆ ئەم میللەتە ببیتە قەڵغان " پیی دەڵیت : گەمژە ! ) .
وشەی ( گەمژە ) لە گویچکەیدا زەنگیدایەوە وەك پارچە بەردیت بهاویژریتە دەریایەکی بیدەنگەوە ، دەنگەکە وەك بەرکەوتنی بەردەکە وابوو بە ئاوەکە ، یان بەرکەوتنی دەست بە شتێکی رەق وەك دەستدان بە یەکدا یان زللە .
ئایا کەسێک چەپڵەی لیدا ؟ گویچکەی چەند دەنگیکی بیست . ئایا چەپڵە بوو ؟ یان پیکەنینیکی خێرابوو وەك قاقا ؟ پاشان دوبارە بیدەنگی باڵی کیشایەوە بەسەر هۆڵی دادگادا . دەنگیکی دریژ تیایدا گویی لە ترپەی دڵی بوو ، و گویچکەی هیشتا هەر ئەو لیدانە و ئەو دەنگەی تیدا ماوەتەوە کە لە شێوەی زللە یان قاقادا بوو . خۆی لەخۆیدا ئەو پرسیارەی کرد کییە ئەو کەسەی بتوانیك چەپڵە لیبدات یان قاقا لەو ساتە ترسناکەدا کە کەسایەتیەکی پایە بەرز بە گەمژە ناو ببریت ؟
جەستەی هیشتا بە کورسیەکەوە بوو ، لە ئامیزی گرتبوو ، دەترسیت لەناکاو لەژیری راکیشریت . برینەکەی ژیر میزڵدانی هیشتا خوینی لی دەچۆڕِیت ، لەگەڵ ئەوەشدا توانی کەمیك سەری و چاوە نیمچە هەلاَتوەکانی بسوڕِینیت تا بزانیت سەرچاوەی ئەو چەپڵەیە لەکویوەیە . لەپڕ بۆی دەرکەوت کە هۆڵەکە لێوانلێوە لەسەر و هەموو پیکەوە لکاون وەك ریزبەندی ، بیگومان هەمووی سەری مرۆظن . هەندیك لەسەرەکان قژیکی زۆریان پیوەیە وەك سەری ئافرەتان یان کچان بیت ، و هەندیکی تریان بچوکن وەك سەری منداڵ بن . و ئەو سەرەش لەسەری خوشکە بچکۆلانەکەی دەکات .
جەستەی راپەڕِی کاتیك بەچاوەکانی دەگەڕِا لەسەر کورسیە

تەختەکە و چاوەکانی دەگەڕِا : ئایا هەر خۆی بە تەنها هاتووە یان دایك و باوکیشمی لەگەڵە ؟ ئایا ئیستا هاتون سەردانم بکەن ؟ ئەبی چۆن بم لایان ؟ ئایا دەبیت بمناسنەوە ؟
سەری و چاوەکانی دەسورِان ، چاوەکانی لاواز بوبوون بەڵام لەگەڵ ئەو لاوازییەش دەیتوانی دایکی ببینیت . توانای هەیە لە ناو هەزاران بیناسیتەوە بە چاو نوقاویش بیت . ئایا دەبیت دایکی لەو هۆڵەدا بیت ؟ ترپەکانی دڵی زیادی کرد ، و بۆچونەکان جەستەی لە ناوەوە دەهەژینیت.
زۆرجار جەستەی ئەو حاڵەتەی بەسەر دەهات و هەستی دەکرد کە دایکی شتێکی بەسەر هاتووە . شەویکیان کاتیك وەك ئاژەڵیکی بچکۆلانە خزابووە کونجیکەوە لەخۆیی پرسی : لەوانەیە مردبیت و کاتیك ئازاد دەبم نەیبینم . بەڵام بۆ رۆژی دواتر بینی . بەسەردان هاتبوو بۆلای . بە تەواوی جەستە و مێشك و بە تەندروستیەکی باشەوە هاتبوەلای و زۆری پیخۆش بوو پیی وت : نەمری دایە تا دیمە دەرەوە و هەموو ئەو ئازارانەی بەهۆی منەوە چەشتوتە بۆتی قەرەبۆ دەکەمەوە.
دەنگەکە ئیستا ئاشکراترە لە گویچکەیدا . بریتی نیە لە تەنها چەپڵەیەك ، بەڵکو چەندین چەپڵەی یەك لەدوای یەك ، و سەرەکان لە هۆڵەکەدا زۆر دەجوڵین . دادوەر هیشتا لەژیر پیلاَوەکەدا بەسەر بی موەکەیەوە دانیشتووە ، و چەکوشە تەختەکەش بە دەستیەوەیە و خێراخێرا دەیدات بەسەر مێزە تەختەکەی بەردەمی . بەڵام چەپڵەکان تەواو نەدەبوون . لەناکاو دادوەر هەستایە سەرپی و سەری چووە ئاستی ورگی وینەکە و چەند وشەیەکی وت بەڵام نەیتوانی لەبەر زۆری ژاوەژاوی ناو هۆڵەکە بزانیت چی وت .
پاشان ماوەیەکی کەم بیدەنگی باڵی کیشا ، و ئەویش هەوڵدەدات ببینیت ، دەستەکانی لەملاولاوە کورسیەکەی ژیری گرتووە ، گرتویەتی بە توندی و پەستانی خستوەتە سەر ، وەك ئەوەی بیەویت

دڵنیابیت لە بوونی ئەو کورسیە لەژێریدا ، یان بوونی ئەو لەسەری ، و دڵنیابیت لەوەی کە هیشتا دانیشتووە . هەستیکرد بەئاگایە و نەنوستووە چاوەکانی نەنوقاوە . ئەو کاتیك چاوەکانی دەکردەوە و درندەکە نەدەما خۆشحاڵ دەبوو و دەیزانی کە تەنها خەون بووە . بەڵام ئەو توانای خۆشحالبوونی نەماوە و دەترسیت چاوەکانی بکاتەوە .

دەنگەکان لەهۆڵەکەدا کەم بوونەوە و سەرەکان دەجولاێن . تەنها سەریك نەبیت . نەلووسە و نە سوریش ، بەڵکو قژیکی زۆری سپی هەیە ، چرژە وناجولێیت ، چاوەکانیش ناجولێن ، کراوە و بیجوڵە لەسەر ئەو جەستە چەماوە بەسەر میزە تەختەکەدا . دەستەکانی بەنوقاوی لەسەر سنگیتی ، و دڵیشی لەژێر دەستەکانی لیدەدات و هەناسە برکیی پی کەوتووە وەك ئەوەی لە جیمی یەکەمەوە رایکردبیت و توانای نەمابیت ، دەنگی پچرپچرە کاتیك بەخۆیی دەوت : خوایە چاوەکانی بەرەو لای من دەجولێیت بەڵام نامبینیت ، چیان لەچاوەکانی کردووە ، یان بەرهەڵستی نوستن دەکات ؟ ئەی خوای زەوی و حەوت ئاسمانەکان ! بۆ هیشتت وای لی بکەن ؟ ئەی کچم تۆ چۆن بەرگەی ئەو هەموو ئازارەت گرتووە . بەڵام من کچی خۆم وامدەزانی تۆ توانای هەموو شتێکت هەیە ، گەر جولاێندنی چیاکان و هارینی بەردیش بیت . هەرچەند جەستەت بچوك و لاوازە وەك جەستەی من بەڵام کاتیك بە پی لەقەکانت لەدیواری سکمت دەدا بە قاچە بچکۆلانەکانت بەخۆمم دەوت : ئەی خوایە چ هیز و توانایەك هەیە لە ناو جەستەمدا ! تۆ لە جوڵەکانتدا پتەو بووی کاتیك کۆرپە بوویت و لە سکمدا بویت . دەتهەژانم لە ناوەوە وەك چۆن بورکان زەوی دەهەژینیت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی کە جەستەت وەك جەستەی خۆم بچوکە ، و ئیسکەکانت نەرم و ناسکن وەك ئیسکەکانی باوکت ، و بالاێت باریك و دریژ وەك بالاێی داپیرەت ، و قاچەکانت گەورەن وەك قاچەکانی

پیغەمبەران . کاتیکیش لەدایك بویت داپیرەت لامەوە بوو لێوی دەکرۆشت و دەیوت : کچیش و ناشرینیش ! لەم دوو کۆستە ! ماسولکەکانم کۆکردەوە تا کەمیك خوین بەربونم کەمبیتەوە و رەحمم داخەمەوە و بە هەناسە تەنگیەکەوە پیموتیت : ( لەدایك بونت قورس بوو وەك ئەوەی چیایەکم بوبیت ) : لەگەڵ ئەوەشدا شیرینترین شتێکە لام لە دونیادا . و نامی بە سنگمەوە و خەویکی قوڵم لیکەوت . ئایا کچم دەتوانم بە خەویکی تری لەو شێوەیە بگەمەوە و تۆش لە سنگمدا بیت یان لای کەم لە تەنیشتمەوە بیت ، دەست دریژکەم بەرت بکەویت ، یان لەژوورەکەی تەنیشتمەوەیت ، لەسەر پەنجەکانی من هەستە سەرپی تا بە نوستویی بتبینم ؟ زۆرجار بەتانیەکە لەسەرت لادەچوو کە دەنوستیت پیمدا دەدایتەوە . زۆر شەو شتێک بەئاگای دەهینامەوە و لەسەر نوکی پەنجە دەهاتمە ژوورەکەت . چ شتێک و لە چ ساتیکدا . ئایا لەو ساتەدا بووە کە بەتانیەکە لەسەر جەستەت لادەچوو ؟ بەڵام من دەمتوانی بەردەوام هەستت پی بکەم ، تەنانەت گەر سەفەریش بکەیت ، و لەبەر چاوم نەمینیت ، و گەر لەژیر زەویشدا بتشارنەوە ، لەژیر حەوتەمین زەویدا ، و بە بەرد و دیوار و ئاسنیش هەڵتچنن ن من هەستم بە بەرکەوتنی هەوا دەکرد بە جەستەت وەك جەستەی خۆم بیت . هەندیك جار سەرمسورِدەما ئایا دامناویت یان هیشتا لەناو سکمدایت ، گەرنا بۆ هەست بەو بەرکەوتنی هەوایە دەکەم بە جەستەت ، یان برسیتی کە بۆت بیت ، و ئازارەکانت ئازاری منن ، وەك پیوەدانی ئاگر لە سنگ و سکمدا . ئەی خوای زەوی و حەوت ئاسمانەکان چۆن توانای بەرگەگرتنی جەستەی منیش و تۆش کراوە ؟ بەڵام من بەرگەم نەدەگرت گەر خۆشی و خۆشحاڵی ئەوە نەبوایە کە کچمی ، و من تۆم بووە ، و توانات هەیە سەرت بەرز راگریت لەسەر چیا پیسەکان ، سی هەزار و بیست و پێنج کاتژمیر ( کاتژمیر کاتژمیر بژاردوومە ) جیبان هیشتوی لەگەڵ هیڵنج و ئازار

و برینــی تەرِ ، چاوەکــانتم دیــتەوە بیــر کاتیــك تەلبەنــدەکەمان لە نیواندا بوو پیت وتم : گەر خوینبەربوون خوینی سوور بیت ، بەڵام ئەو سوور نیە ، ئەو سپیە ، بۆنیشی وەك مردنە . ئەو رۆژە چیم پیوتی ؟ نازانم . بەڵام من شتێکم وت ، پیموتی گەر لەگەڵ بۆن و بەرام ماوەیەکی زۆر بژین رادیین لەگەڵی . نەمتوانی سەرم بەرزکەمەوە و لە روخساری رەنگ پی نەماوت برِوانم بەلآم گویم لە دەنگت بوو وتت : دایە ئەو بۆنە وەك هەر بۆنیکی تری ئاسایی نیە کە دەچیتە دەم و لوتەوە ، بەڵکو شتێکە وەك هەوای شڵ ، یان وەك هەڵمیك کە دەبیتە ئاویکی لینج ، یان وەك ئاسنیکی تواوە چۆتە هەموو خانەکانی جەستەوە ، ناشزانم دایە کە ئایا گەرمە و داخە . یا ساردە وەك بەفر . دەستم خستە سەر سنگم و دەستە باریکەکانتم لە تەلبەندەکەوە گوشی و پیموتی : کاتیك گەرم وەك ساری لی دیت کچم هەموو شتێک دەشیت . هەرهیندەش کە جیمهیشتی هەستم کرد دڵم دەتویتەوە و هەموو سنگمی داگیرکردووە و تواناى هەناسەدانم نەماوە . وەك خنکاندن بۆیە لەتم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان تا هەوا راکیشمە ناو سنگمەوە . بەڵام ئەو رۆژە ئاسمان هەوای تیدا نەمابوو ، و خۆر راگیراوە لەسەر سەرم وەك ئاگری جەهەنەم ، و چاوەکانی پاسەوانەکانیش پیوەم دەدەن ، و دەنگە ناشرینەکانیشیان کە وەك بەڵغەم وابوو هیشتا لە ناخمدایە . ئای گەر زەوی ببوایەتە روخساری هەریەك لەوانە تفم دەکردو تف و تف و تفم دەکرد تا گەرو و سنگم وشك دەبوو . بەڵی کچم ماسولکەکانی پشتت گورج بکەرەوە وسەرت بەرزکەرەوە من لە تەنیشتتەوە دانیشتووم ، گویم لییان بوو چەپڵەیان بۆ لیدەدایت ، ئایا گویت لییان بوو ؟ و بینیمی سەرت دەجولاَند بۆلامانەوە دەتبینین ، من و باوکت و خوشکە بچکۆلانەکەت ، هەموومان لەگەڵ ئەوان چەپڵەمان لیدا؟ بینیتین؟

هیشتا چاوەکانی ئەو تارمایبە چرِ◌ەی دەبرِ◌ی ، و هیشتا دادوەر بە سەر بی مووە سورەکەیەوە هەر وەستاوە ، لێوەکانی بەخێرایی دەجولێن و لە تەنیشتیشیەوە سەرە لووسە سورەکانی تر هەن ، کە دوور لەو میزەی لەسەر دانیشتبوون دەجولاَ◌ن ، سەری دادوەر و سەرە لووسەکانی تریش دیار نەمان . بەڵام وینەی سەر دیوارەکە وەك خۆی مابوەوە ، و روخساری وینەکە هەمان ئەو روخسارە بوو ، و هەمان چاوەکان بوون . بەڵام ئیستا چاویکیان لە یەکیکی تریان بچوکترە بەلایەوە ، وەك نیمچە نوقاویلك ، یان وەك ئەوەی چاوی لی داگریت ، ئەو جولە باوەی کە پیاو بۆ ئافرەتی دەکات گەر بیەویت لیی نزیك بیتەوە و بیدوینیت جەستەی لە سەرسورِ◌ماندا و لە ترسا راپەرِ◌ی : ئایا دەشیت چاوی لی داگریت ؟ ئایا دەشیت چاوەکانی ناو وینەکە بجولێن ؟ ئایا بی گیانەکان دەجولێن ؟ یان نەخۆشە و ورِ◌ینە دەکات ؟ بە دەستەکانی هەستیکی کورسیەکەی ژیری وەرگرت ، پاشان دەستی برد بۆ جەستەی و هەستی وەرگرت . و گەرماییەکی زۆر لە جەستەی بەرزدەبیتەوە ، وەك ئاگر ، و شتێك وەك ئاگرکەوتنەوە لەناو سنگیدایە ، دەیەویت دەمی بکاتەوە و بڵیت : پەرداخیك ئاو ، بەڵام لێوەکانی جووت بوون وەك یەك پارچەیان لیهاتووە، وەك هیڵیکی کیشراوی ئاسۆیی ، و چاوەکانی لە سەر وینەکەیە ، و هیشتا چاوەکەی ناو وینەکە ئاماژەی بۆ دەکات . بۆچی ئاماژەی بۆ دەکات ؟ ئایا دەیدوینیت ؟ یان سلاَ◌وی بۆ دەنیریت ؟ نەیدەزانی کە چاوداگرتن جۆریکە لە سلاَ◌وکردن تا ئەوکاتەی ریزیك لە گەشتیارانی بیانی بە شەقامیکدا دەرۆیشتن . ئەو بەرِ◌یوە بوو بۆ زانکۆ ، و هەرکاتیك سەیری هەر پیاویك یان ئافرەتیکی ئەو کۆمەڵەی بدایە بەو جولە سەیرە باوە چاویکیان لی دادەگرت . هیندە سەریسورِ◌ما تا رادەی ترس کە چۆن ئافرەت دەبیت چاو داگریت . بەڵام لە دوایدا زانی کە ئەوە جۆریکە لە سلاَ◌وی ئەمریکاییەکان .

شانۆکەی تریش هیشتا بەتاڵە و سەرە لووسەکان و دادوەری لی نیە لە دەوروبەری ، و بیدەنگی بەردەوامە ، و سەرەکان لەناو هۆڵەکەدا پیکەوە نوساون بەرِیز ، و چاوەکانی لەو تارماییەدا دەگەرِیت بەشوین سەرە قژنە سپیەکەدا ، و بەشوین دوو چاوی رەشدا کە توانای بینینیانی هەیە گەر چاویش لیك بنیت ، بەڵام سەرەکان هەموو پیکەوە نوساون ناتوانیت جگە لە کۆمەڵیك رەشایی یان سپیایی زیاتر ببینیت ، بازنەیی یان چوارگۆشە یا لاکیشە . لوتی کەوتە جوڵە وەك ئەوەی بیەویت بۆن بکات لەبەرئەوەی بۆنی دەناسیتەوە و دەتوانیت لەنیوان هەزاران بیدۆزیتەوە . بریتییە لە بۆنیك وەك شیر کە منداڵ بووە و شیرەخۆرە بووە ، یان وەك بۆنی بەیانیان کاتیك رۆژ هەڵدیت ، یان شەوان کاتیك دەنویت ، وەك بۆنی باران لەسەر زەویەکی خۆڵ ، و تیشکی خۆر لەسەر جیگە ، و شۆربای گەرمی ناو قاپ . لەخۆیی دەپرسی : ئایا دەشیت دایە ون بوبیت ؟ ئایا باوکم هاتووە ؟

تارماییەکی چرِ هیشتا لەپیش چاویتی ، و هیشتا سەری دەجوڵیت بۆلای سەرەکانی تر ، بازنە رەش و سپیەکان ، تیکەڵی یەکتر دەبن لە جوڵە جوڵیان ، تەنها بازنەیەك لەقژ نەبیت بە جیگیری لەسەر ناوچەوانیکی پانی گەنم رەنگی وەستاوە ، دوو چاویش جیگیرە لەسەر ئەو جەستە بچکۆلانە چەماوە لەسەر کورسیەکە لەودیو تەلبەندەکەوە . دوو دەستە گەورە عەرەقاویەکەی گرتبوو بە ئەژنۆکانیەوە ، و لەزۆری ئازاردا پەستانی خستونەتەسەر . بەڵام هەر ئەوەندە کە گویی لە دەنگی چەپڵەکان بوو خیرا دەستی بەردا و چەپڵەیەکی دریژخایەنی لیدا . دەستەکانی نایانەویت دوبارە بچنەوە سەر ئەژنۆکان ، و ئازارەکانی ئیسکەکانی قاچەکانی رەویونەتەوە ، و دڵیشی لەگەڵ چەپڵەکان بەخیرایی لیدەدات و جەستەی لاوازی لەسەر کورسیەکە دەهەژینیت ، چاوەکانی دەستیان بە سورِان کردبوو بە دەوروبەری خۆیدا و سەروخوار کردن وەك ئەوەی

بیەویت هاوار بکات : من باوکیم . منم ( الفرجانی ) ئەوەی دروستی کردووە و ناوی منی هەڵگرتووە . خوایە چۆن سەرجەم ئازارەکانی جەستەم لەگەڵ ئەو چەپلاَنەدا رەویەوە بە یەکجار ؟ چی رودەدات گەر ئیستا کۆتاییان پی هات و کەسیتی راستەقینەمیان بۆ دەرکەویت ؟ ئەم ساتە دەگمەنە و پیویستە لەدەستی نەدەم . پیاوان لە ئیمە دەژی و دەمریت لەپیناو ساتیکی لەوجۆرەدا . لەپیناو ئەوەی ئەوانی تر دانمان پیدا بنین . تا چەپڵەمان بۆ لیدەن . ببینە پاڵەوان و چاوەکان بینە سەرمان و پەنجەکانمان بۆ دریژکریت . و ئازارەکانم لەگەڵ چەشتوە رۆژ لەدوای رۆژ و کاتژمیر بەدوای کاتژمیردا ، و مافی خۆمە کە ئیستا هاوبەشی ئەو پاڵەوانیتی و سەرکەوتنەی بکەم .

جەستەی لەسەر کورسیەکە جولاَند وەك ئەوەی بیەویت هەستیت بەڵام دانیشتەوە و سەری دەجولاَ ، چاوەکانی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەجولاَند بەو هیوایەی کەسێک . لەم نیوەندی چەپڵە لیدانەدا دەنگی دادوەر و تەقەی چەکوشەکەی کە دەیدا بەسەر میزەکەدا تیکەڵ ببوو کە هیندەی نەبرد دادوەر و ئەوانەی لەگەڵی بوون چوونە ژووری بیرورِا ئاڵوگۆرِکردن . و جاریکی تریش بیدەنگی باڵی کیشا بەسەر هۆڵەکەدا . بیدەنگیەکی ترسناکی دریژخایەن ، گویی لەچەند وتەیەك بوو بە چرپە دەهاتنە گویی دەوترا : کیشەکە دەکولێنن لە ژووری بیرورِا ئاڵوگۆرِکردن . ئەوە نەریتیانە . ئیمە نە دادپەروەری و نە یەکسانیمان نیە . ئیستا رایدەگەیەنن کە دانیشتنی ئاشکرا کۆتایی پیهات . ئەو پاڵەوانە بۆیە توانیویەتی تا ئەمرِۆ بژی . بهینە پیش چاوی خۆت ئە کچە بچکۆلانەیەی لەو قەفەزەدا دانیشتووە ئەم هەموو بشیوی و هات و هاوارەی بۆ حکومەت دروستکردووە . ئەزانیت چۆن ئەشکەنجەیانداوە ؟ 10 پیاو یەك لە دوای یەك بەربوونەتە جەستەی . و بە پیلاَو شەرەفی خۆیی و باوکیان شیلاوە . باوکی داماوە !

دەیناسـیت ؟ ئەڵـین نەخۆشـە و لە جـیگەدایە . لەوانەیە نەتوانیـت بەرەنگاری خەڵکی بیتەوە دوای ئەوەی شەرەفیان شکاندووە .
لەم کاتەدا دەستەکانی بەرز بوونەوە تا بیکاتە گویچکەی و نەبیستیت ، و پەستان بخاتە سەر سەری تا سەری دەچیتەوە ناو سنگی ، و زیـاتر و زیـاتر پەسـتان بخـاتە سـەری تـا جەسـتەی دەچیـتە نـاو کورسیەکەوە ، یان ژیر کورسیەکە ، یا ژیر زەوی . دەیەویت فەنا بیـت . دەیەویـت کەس نەیبینیـت و کەس نەیناسـیتەوە . ئەو نـاوی الفرجـانی و الشـرقاوی و تەرِەماشـاوی و هـیچ نـیە . نـاوی نـیە و بوونی نیە : پیاویك لە ئیمە چی بۆ دەمینیتەوە کە شـەرەفی لەدەستدا ؟ زۆرجار پیموتووە : کچی خۆم سیاسەت بواری ئافرەتـان و کچـان نـیە گـویی لـی نەدەگـرتم . گەر پیـاو بـوایە وەك ئیسـتا ئـازارم نەدەچەشـت ، و هـیچ سـەگیکیان نەیـان دەتـوانی دەسـت بـۆ شـەرەفم بەرن . ئیستا مردن بۆ منیش و ئەویش باشترین شتە .
بیدەنگی هیشتا بـاڵی کیشـاوە بەسـەر هۆڵەکەدا ، و هیشتا دادەوەر و سـتافەکەی دەرنەکەوتـوون ، و چاوەکـانی هیشـتا دەگەرِیـت لە هەولیدا بـۆ زیـاتر بینـین ، لەنیـوان دەموچاوەکانـدا بـۆ دەموچاویـك دەگەرِیت ، بۆ دوو چاو دەیناسیت ، بۆ قژیکـی زۆری سپی وەك شیری منداڵ ، بەڵام هەموو ئەونەی دەیبینین بریتـی بوون لە بـازنە چوارگۆشەی رەش و سپی تیکەڵ و بەردەوام جولاَو . ئایا دەشیت ون بیـت دایە ؟ ئەی بـاوکم هیشـتا نەخۆشـە ؟ و لوتیشـی لـیەولەوی دەگەرِی بۆ بۆنیکی باو ، بۆ بۆنـی سنگیکی گەرمـی پڕ لەشیر ، و بۆنـی خۆر و پرژەی بـاران لەسـەر پوش و پەلاَش . بەڵام لوتیشـی توانای بۆنکردنی نەماوە . هەموو ئەوەی دەتوانیت بۆنـی بکـات بۆنـی جەسـتەی چەمـاوەیەتی لەسـەر کورسـیەکە و بـرینەکەی نیـوان قاچەکـانی ، بـۆن ساردی و خـوین ، و بـۆن هەناسـەی نـاخۆش ، و بـۆن عەرەقـی 10 پیـاو ، هیشـتا شـوینەواری نینۆکەکانیـان بەسـەر جەسـتەیەوەیەتی ، و دەنـگە ناسـازەکانیان و تـف کـردنە

ســـەرکۆئەندامەکانیان ، و یەکیکیـــان پیـــی دەوت کاتیـــك بەســـەر جەستەیەوە بوو : ئەمەیە ریگەی ئیمە بۆ ئەشکەنجەدانی ئافرەتـان ، بە بەهاترین شتیان لی زەوت دەکەین . جەستەی لەژیریدا ساردبوو وەك لاشە ، بەڵام توانی هەرچۆنیك بیت دەمی بکاتەوە و پیی بڵیت : هەی گەمــژە ، ئەوەی بە بەهـــایە لام لەنیـــوان قاچەکانمـــدا نـــیە ! هەمووتان گەمژەن ، لە هەمووشتان گەمژەتر گەورەکەتانە .
ملـی هینـایە پیشـەوە تـا ئەو تارمـاییە بشیوینیت و چـاوە لاوازەکـانی شتێک بەدی بکات . و سەرەکا هیشتا پیکەوە نوساون ، و چاوەکـانی لە هەوڵدانـدان . گەر بتوانیت تەنهـا چـرکەیەك دایکـی ببینیـت ، یـان باوکی ، یا تەنانەت خوشکە بچکۆلانەکەی شتێکی سەیری پی دەوتن . پیی دەوتن کە ئەوان لەو جۆرە ئەشکەنجەدانە دوور کەوتونەتەوە کە زانیویانە هیچ کاریگەرییەکی نیە لەگەڵی ، و دەستیان کردووە بە گەرِان بۆ شیواز و ریگە چارەی تر .
لە ژووری بیـرورِا ئـاڵوگۆرِکـردن لە تەنیشـت هـۆڵی دادگـاوە دادەوەر و هاوکـــارانی لە کۆبـــونەوەدا بـــوون ، لە کیشـــەکەیان دەکۆڵییەوە . چـی بـکەن ئیسـتا کە هەمـوو ئامـادەبوان چەپڵەیـان بـۆ تاوانبار لیدا . و دادوەر لای خۆیەوە دەستیکرد بە تۆمەتبارکردن :
- قوربان ئیمە تاوانەکە ناخەینە سەرتۆ ، بەڵام تۆ شـەرمەزاریت بـۆ هەمووومان دروستکرد . وەك دەڵین ویستت کلـی بـۆ تیکەیت کویرت کـرد (خـوا بیپاریزیت و بـۆ ئەم میللەتە ببیتە قەڵغـان تـا هەتـایە) ئەو گەمژە !
- حاشـا قوربـان . مـن وام نەوتـووە . بەڵکـو وتـم کە ئەو کـچە وای وتووە .
- ئەوی راسـتی بیـت قوربـان تـۆ بە ئاشـکرا ئەوەت سـەلماند کە گەمژەیە .

- مـــن ئەوەم رانەگەیانـــدووە گەورەم . مـــن تەنهـــا ئەوەم دوبـــارە کردۆتەوە کە تاوانبار وتویەتی تا تۆمەتەکەی بەسەردا بچەسپینم و ئەوە ئەرکەکەمە .
- ئەوە ئەرکی خۆتە قوربان ئیمە ئەوە دەزانین ، بەڵام پیویست بوو زیاتر ئاگادار و وریابیت .
- هیچ تیناگەم .
- نەتبینی خەڵکی چۆن چەپڵەیان بۆلیدا ؟
- گوناهی من چیە ؟
- نازانی بۆچی چەپڵەیان لیدا ؟
- نەخیر نازانم .
- لەبەرئەوەی تـــۆ ئەو شـــتەت وتەوە کە لە نهینـــی و بە دزیەوە دەوتریت بە شیوەیەکی ئاشکرا راستیەکانت دەرخست وەك لەوەی تۆمەتەکە بچەسپینیت .
- ئەی جگە لەوە گەورەم من دەمتوانی چی بکەم ؟
- دەتـوانی بڵییت کە وتەی ناشرنی بە خـاوەن شکۆی گەورە وتـوە بێئەوەی ئەو وتانە بڵییتەوە .
- گەر یەکیك پرسیاری ئەو وتانەی لیکردم ؟
- کەس لیـی نەدەپرسیت ، بەڵام تـۆ خۆبەخشـانە وەلاَمەکەتدایەوە بێئەوەی کەس پرسیار بکات ، وەك ئەوەی بتەویت بە ئاشکرا زمانی ئەوەوە تۆ شتێک بڵییت ، یان ئەوەی لە نهییدا وتوتە ئاشکرای بکەیت .
- گەورەم من ؟ ئایا ئەشیت بەو شیوەیە تۆمەتبارم بکەیت ؟! من تەنها ئەرکی خۆمم بەجی هیناوە ، کەس ناتوانیت بە هیچ شتێک تۆمەتبـارم بکـات . لەوانەیە ( گەمـژە ) بـووبم بەڵام بەهەرحـاڵ مەبەستم خراپ نەبووە .
- بەڵام ( گەمـژە ) یـی هەنـدیك جـار لە نـیەت خراپـی بیکەڵکتـرە نازانیت کە ( گەمژەیی ) خراپترین تایبەتمەندیتیە کە بدریتە پاڵ پیاو

ن چ جـای ئەو پیـاوە پیـاویکی لەو شـێوەیە بیـت ؟ ئەو پیـی خۆشـە فیلْبـــاز بیـــت ، دۆرزنبیـــت ، نەهـــامەتی بیـــت ، بەڵكـــو دز و خیانەتكاربیـــت ، بەڵام (گەمـــژە)؟! گەمژەیـــی مانـــای ئەوەیە ( بیرناکـاتەوە ) ، بە واتـایەکی تـر ئەو بـی مێشـکە ، واتە ئـاژەڵە . کە ئەمە تایبەتمەنـدیەکی خـراپە گەر بە پیـاویکی ئاسـایی بوتریـت ، چ جـای گەر فەرمـانرِەوابیـت ؟ تـۆش فەرمـانرِەواکـان ناناسـیت قوربـان . من چاك دەیانناسم . هەر یەكیك لەوانە وا هەست دەكات كە مێشـكی ئەو لە مێشـكی هەمـوو پیاویـك باشـترە . ئەوە نەك هەر بۆچوونە بەڵكو برِوابونیكی كویرانەیە وەك برِوابوون بە خـوا ، و لەپیناو ئەو خەیاڵەشدا دەشیت بە هەزاران بكوژرین .

- مــن ئەوەم نەدەزانــی گەورەم . ئەی چــۆن خــۆم لەو تیــوەگلانە رزگارکەم ؟

- نـازانم بـۆچی بە وشـەی ( گەمـژە ) دەستت پیکـرد ، لەگەڵ ئەوەی گەر وتەکــانی بخــوینیتەوە وتەی خراپتــری داوەتە پــاڵ بەدەر لەو وشەیە .

- ئەو وشـە و تایبەتمەنـدیانە چـیە گەورەم ؟ تکـایە بەپیـی سـەلیقەیی خۆت یـارمەتیم بـدەیت کەمیکیـانی تیبگەم . مـن نامەویت لیرە بچمە دەرەوە وەك تۆمەتباریك كە بەیانی بۆ ئەوە هـاتووم تـا تۆمەتیك بـدەم بەسەر كەسێكدا .

- بەڵام قوربان ئەو وتانە ناوتریت لە شێوە دانیشتنیکی ئـاوا ئاشكرادا . پیویستە دانیشتنەكە نهینی بیت . واتە ئەو وشەیە هەرچەند قیزەون بیت دەنگدانەوەی دەبیت لە ناخەكاندا گەر بەئاشكرا وترا . هەر لەم پیناوەشـدایە دانیشـتنە نهینیەکـان دروسـتکراون . زۆر شـت نـایەت بە خەیاڵتدا و من بزانم سەلیقەیی و شارەزاییت لە یاسادا كەمە .

پاش چەند ساتیكی كەم ، دەنگیكی تیژ هاتە هۆڵەكەوە ، و هۆڵەكە بە تەواوی چـۆڵكرا . ئەویشـیان بـردەوە بـۆ ئەو جـێگەیەی لێـوەی هینابویان .

